

# به وێنەوە
# شۆردن و کفن و
# لە گۆڕنان
# بزانە


دانانی

فاریق ملا اسماعیل پیرزینی


٧

# بە وێنەوە
# شۆردن و کفن ولە گۆرنان بزانە


دانانی

فاریق ملا اسماعیل پیرزینی



چاپی یەکەم

ژمارەی سپاردن (649)

تیراژ (1000) دانە

سالی (2011)

نەخشەسازی

جمعە صدیق کاکە

**پێشکەشە:-**

**بە روحی پێغەمبەرمان نوری چاومان محمدﷺ**

**وەبە باوک ڕ دایکی خۆشە ویستم وەهەروەها**

**بۆ ئەو کەسانەی کە تینوی زانینی ئاینی ئیسلامن**

بسم الله الرحمن الرحيم

الحمد لله رب العالمين وأفضل الصلاة وأتم التسليم على سيد الأولين والآخرين، وعلى آله وأصحابه أجمعين، والتابعين لهم بإحسان إلى يوم الدين وسلم تسليماً كثيراً. وأشهد أن لا إله إلا الله وحده لا شريك له، خلقنا ليثبت لنا انه على كل شيء قدير، ورزقنا ليثبت لنا أنه أكرم الأكرمين، ويميتنا ليثبت لنا أنه القهار ذو القوة المتين، ويحيينا ليثبت لنا أنه أحكم الحاكمين وأعدل العادلين وأسرع الحاسبين، وأشهد ان سيدنا ونبينا وحبيبنا وشفيعنا محمداً رسول الله ﷺ هو الحبيب الذي لو كُتب البقاء لأحد من البشر لكتب له وحده، ولكن الله قال:» إنك ميت وإنهم ميتون).

يا خير من دُفنت في القاع أعظمه فطاب من طيبهن القاع والأكم
نفسي الفداء لقبر أنت ساكنه فيه الغفاف وفيه الخير والكرم
أنت الشفيع الذي تُرجى شفاعته عند الصراط إذا ما زلّت القدم
وصاحباك فلا أنساهما أبدا مني السلام عليكم ما جرى القلم

إخوتي في الله: اعلموا أن الموت يعمنا، والقبر يضمنا، والقيامة تجمعنا، والله يحكم بيننا وهو خير الحاكمين.

وبعد:

لەخوای گەورە داواكارم لە گوناهی هەموو موسڵمانان خۆش بێ بەتایبەتی ئەوانەی كەلە دونیا ژیان و كاریان پچراوە . هیوادارم ئەم پەرتوكەم ببێتە جێگای رەزامەندی ئەوخوایەی كەگیانی هەموو بونەوەرێكی بەدەستەو لێمانی قبول بكا وەبیكاتە پاداشتی ئەو رۆژەی كە كەس بە هانای كەس نایێ ئامین.

موسڵمانی بەرێز: پاش ئەوەی لەگەڵ هەندێك لەو برا بەرێزانەی كە هەڵدەستن

بەشۆردنی مردوو گفتو گۆم کرد لە باسی چۆنیەتی شۆردنو کفن کردنی مردوو بینیم کەمو کوڕیەکی زۆریان هەیە کە ئەویش دەبێتە هۆی ئەوەی ئەم کارە بە واجب لە سەر هەمووومان بمێنێتەوە لەبەر ئەوە کارەکە لەڕووی شەرعیەوە جێبەجێ نەکراوە بۆ نمونە رۆژێك یارمەتی مردوو شۆرێکی بە تەمەنم دەدا بە گۆتەی خۆی پەنجا ساڵە ئەو مردوو شۆرە سبحان الله شتێکی سەیرم لێ بینیی ئەویش بەو پەرۆیەی کە مردووەکەی پێ دەشوشت لە ناوی وورده صابون هەبوو غوسلی پێ لە مردوو دەردەکرد منیش وتم ئەوە نابێ چونکە لە شەریعەتی ئیسلام پێی دەڵێن (ماء مستعمل)واتە ئاوی بەکار هاتوو کە ناتوانین بۆ غوسل یا دەست نوێژ بە کاری بهێنین هەروەك لە سەرچاوەکانی کتابی شەرعی باس کراوە جا ئەویش بە سەرسوڕمانەوە ووتی خۆ من گوناه بار نیم چونکە لە مێژە ئەم کارە دەکەم منیش وتم خوا دەزانی ئەگەر کەم تەرخەمیت کردبێت ئەوە گوناه باری بەڵام لێرە من دەڵێم کێ گوناه بارە !.بە داخەوە کە زاناکان واتە (خواص)ن بە هەموو لایەکی ئەم کارە دەزانن بەڵام بەرێژەیەکی کەم بەژدار دەبن کە چی ئەوانەی کە(عوام)ن واتە خەڵك ئەم کارە بە باشیش نازانن بەڵام هەڵدەستن بە ئەنجام دانی ئەم کارە.جا بە باشم زانی ئەم کتاب بە وێنەوە دابنیم تاکو زانینی ئەم کارە لای خەڵك ئاسانتر بێت وە کارەکانی یەك لە دوای یەك رێکی بەخەم لە ڕووی جێ بە جێ کردنی لەبەر ئەوەی لە کتابی شرعیەکان تۆزیك پێش و پاشی هەیە بەس مامۆستایانی ئاینی ئیسلامی پیرۆز دەزانن لای خەڵك تۆزێك گرانە تێگەیشتنی. جا موسڵمانی بەرێز مردوو شۆر دەبێ چەند مەرجێکی هەبێت هەر وەك لە کتابی (الحاوی الکبیر الماوردی) هاتووە(**فَأَمَّا الْغَاسِلُ فَيَنْبَغِي أَنْ يَكُونَ مَوْثُوقًا بدينه وَأَمَانَته ، عَارِفًا بغُسْله وَنَظَافَته ، غَاضًا طَرْفَهُ وَبَصَرَهُ للميت حَسَبَ طَاقَته وَإِمْكَانه**)ج٣ص١٤. واتە (ئەو کەسەی کە مردوو شۆرە دەبێ ئەمین بێ بە ئاینی لەگەڵ ئەمانەتی وە زانابێ بە شۆردنی مردوو لەگەڵ پاکو خاوێنی، وەچاوەکانی بپارێزێ لە بینینی عەورەتی مردوو بە گوێرەی توانا).

مەلا عبدالكريم مدرس لە كتابی ڕێگای بەهەشت لاپەرە١٧ بە شیعر باس دەكا:

شۆردنی مردوو بە یاسای ئیسلام          ئادابی هەی بیزانن بە عام

بەڵام بەداخەوە زۆر بە كەمی ئەم شتانەیان لێ دێتەجێ .لە كۆتایدا داواكارم لە یەكێتی زانایانی ئیسلام یاخود وزارەتی ئەوقاف بە كردنەوەی خولێكی چەند رۆژە بۆ ئەو براو خوشكانەی كە مردوو شۆرن تاكو شارەزابن لەم كارە وە هەروەها ببنە یارمەتیدەرو سەرپەرشتیاری ئەو خەڵكانی كە دمیانەوی بەخۆیان كەسوكاریان بشۆن جونكە كەس وكاری مردوو لە پێشترن بۆ شۆردن نەوەك بێگانە.جا ئەمە تاكە رێگایە تاكو هەموومان لەو گوناهە ڕزگار بین .

**اللَّهُمَّ فشْهَد أنّي بَلَّغتَ وصلى الله على سيدنا محمدا وآله وأصحابه وأمته اجمعين.**

٨/ رمضان ٢٠١٠

# [ مردن چیه]

* قال العلماء : الموت ليس بعدم محض و لا فناء صرف و إنما هو انقطاع تعلق الروح بالبدن و مفارقته و حيلولة بينهما ، و تبدل حال و انتقال من دار إلى دار ، و هو من أعظم المصائب ، و قد سماه الله تعالى مصيبة ، و في قوله تعالى( فأصابتكم مصيبة الموت)المائدة ١٠٦. التذكرة للقرطبي ص٨.

موسڵمانی بەڕێز: زاناکان دەفەرموون مردن بە مانای ئەوە نیە کە نەبێ یا لە ناو جوونێکی کۆتایە بەڵکو پچرانی روحە لە لاشە . گۆرانکاریە لە ماڵێك بۆ ماڵێکی تر واتە لە ماڵی دونیا کۆچ بکەی بۆ ماڵی کۆتایی.وە مردن کارەساتێکی گەورەیە هەر وەك خوای گەورە لە قورئانی پیرۆز باسی کردوە لە سورەتی (مائدە ئایەتی ١٠٦) ( فأصابتكم مصيبه الموت).

*قال علماؤنا: وأعظم منه الغفلة عنه، والإعراض عن ذكره، وقلة التفكر فيه، وترك العمل له. التذكرة للقرطبي ص٨

وهەروەها زاناکان دەفەرموون لە مردن گەورەترە ئەویە کە بێ ئاگا بی لێی، هەروەها رازی نەبوونی بە باس کردنی، لەگەڵ کەمی بیرکردنەوە، وە کار بۆ نەکردنی.

*وَعَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ (أَكْثِرُوا ذِكْرَ هَاذِمِ اللَّذَّاتِ) يَعْنِي الْمَوْتَ.سنن ابن ماجةج٢ر١٤٢٢.

واتە : پێغەمبەرمان(ﷺ) دەفەرمووێ(زۆر باسی پچرێنەری خۆشیەکان ژیان بکەن) کە مردنە.

# [پاش مردن روح بۆ کوێ دەچێت]

موسڵمانی بەڕێز : پاش ئەوەی تۆ لە دونیا لەگەڵ دایك و باوك و کەسوکارت بووی کۆچ دەکەی بۆ جیهانی بەرزەخ کە ئەم جیهانە پڕە لەرەحمەتو سۆزو میهرەبانی خوای گەورە ئەویش تایبەتە بە موسڵمانان چونکە پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویتی (**إن الله عز وجل خلق مائة رحمة منها رحمة يتراحم بها الخلق و تسع و تسعون ليوم القيامة**) رواه مسلم ج٨ص٩٨ر٧١٥١. واتە: خوای گەورە سەد بەشە رحمەتی دروست کرد یەك بەشە رەحمەتی بۆ هەموو دروستکراوەکانە لە دونیا نۆهەدونۆشی بۆ قیامەتە.

جا ئەو نۆهەدونۆیە بۆ ئیماندارانە بێ بڕوایان ناگرێتەوە جا بزانە چۆن لەگەڵ ماڵەوە بوین لەدونیا ئەگەر موسڵمانێکی وا بین چۆن خواو پێغەمبەرەکەی پێیان خۆشە خوای گەورە بەهەمان شێوە لەجیهانی بەرزەخەوە کۆمان دەکاتەوە هەر وەك ئەم صحابەی پێغەمبەرﷺ کە ناوی بلال بوو رەزاو رەحمەتی خوای لەسەربێت پێش مردن دەیفەرموو:

غدا نلقى الأحبة          محمدا وحزبه

لە کتابی تاريخ دمشق /باب/بلال بن رباح ص٤٧٥ و سير أعلام النبلاء باب/بلال بن رباح ج١ ص٣١١

واتە: بەیانی لیقای خۆشەویستانمە محمد(ﷺ) لەگەل هاوەڵەکانی.

ئەو صحابە بەڕێزە تأکید بوو کە خوای باڵا دەست لە جیهانی بەرزەخەو لەگەڵ خوشەویستەکانی کۆی دەکاتەوە هەروەك پێغەمبەرمان(ﷺ)دەفەرمووێ:

(**الْمَرْءُ عَلَى دِينِ خَلِيلِه فَلْيَنْظُرْ أَحَدُكُمْ مَنْ يُخَالِلُ**).

سنن ابي داود ج٢ ر٤٨٣٥ والترمذي ج٤ر٢٣٧٨وغيرهم.

واتە ئێوە لەسەر ئاینی خوشەویستەکانتانن. واتە لەدونیا کێت خۆشدەویست لە قیامەت لە گەڵ ئەو دەبی جا ئەگەر خواو پیغەمبەرو موسڵمانانت خۆشویست لە قیامەت لەگەڵ ئەوان دەبی. بەڵام ئەگەر خوا نە خواستە زاڵم وستەم کارو مرۆڤی

بێ بڕوات خوش ویست لە دونیا لە قیامەت لەگەڵ ئەوان دەبی هەر چەندە بەناو موسڵمان بێ یان نوێژ بکاو ڕۆژی بگری سوودی نیە.

جا موسڵمانی بەڕێز باش بیر بکەوە وە بزانە تۆ کێت خۆش دەوێ لەو دونیا وە هاوڕێیەتی کێ دەکەی، جونکە لە دوارۆژدا پەشیمانی داد نادا. کەوا بوو ئێمەش انشاءالله وەك بلال بە پەرۆشی ئەو لیقایەین کە بگەیینە خزمەت خۆشەویستمان نوری چاومان محمدﷺ لەگەل صحابە بەڕێزەکان رەزاو رەحمەتی خوایان لەسەربێت.

کەوا بوو مردن شتێك نیە ئێمە وای لێ دەترسێین بۆمان دەرکەوت کە جیهانی بەرزەخ چەند خۆشە ئەگەر موسڵمانی ڕێکوپێك بین. هەروەها لەسەر ئەوەی کە روحی ئیمانداران پێك دەگەن لەم فەرموودەدا هاتووە:

**وروى أبو هريرة عن النبي صلى الله عليه وسلم قال: إن أرواحكم تعرض إذا مات أحدكم على عشائركم وموتاكم، فيقول بعضهم لبعضهم: دعوه يستريح فإنه كان في كرب. ثم يسألونه: ما عمل فلان؟ وما عملت فلانة؟ فإن ذكر خيراً حمدوا الله واستبشروا، وإن كان شراً قالوا: اللهم اغفر له حتى أنهم يسألون، هل تزوج فلان؟ هل تزوجت فلانة؟ قال: فيسألونه عن رجل مات قبله فيقول: ذاك مات قبلي؟ أما مر بكم؟ فيقولون: لا والله. فيقولون: إنا لله وإنا إليه راجعون. ذهب به إلى أمه الهاوية، فبئست الأم وبئست المربية، حتى إنهم ليسألونه عن هر البيت.**

كتابي التذكرة للقرطبي ص ٥٩... بە درێژی باس کراوە.

واتە پاش مردن روح بە هۆزو کەسو کاری مردووەکان دەگات، پاشان بە یەکتر دەڵێن جارێ وازی لێبینن با پشو بدات لە بەر ناخۆشی روح کێشان، لە دوادا پرسیاری لێ دەکەن، کە کەسوکاریان چیان دەکرد جا ئەگەر بە باشە بۆیان باس بکا ئەوە سوپاسی خوا دەکەن بۆ ئەو مژدە خۆشە، بەڵام ئەگەر بە خراپە باس لە کەسوکاریان بکە دەڵێن: خوایە لێیان خۆشبی هەتاکو پرسیار لەوەش دەکەن ، ئایا ئەو کەسە ژنی هێنا یا ئەو کچە شوی کرد: پاشان پرسیار لە پیاوێك دەکەن کە لە پێشەوی مردوە

دەڵێت: ئەو پیشە من مرد ئای بە ئێوە نەگیشتییە دەڵێن: نا بەخوا هەموو دەڵێن إنا لله وإنا إليه راجعون رویشت بۆ هاویە (هاویە یەکێکە لە ناوەکانی دۆزخ خوای گەورە بمانپارێزی ئامین)، وەهەروەها پرسیار لەو پشیلەی مالەوەش دەکەن.

ئینجا موسڵمانی بەڕێز بزانە لە هەموو خۆشتر ئەوەیە لیقای خوای گەورەیە لە رۆژی دوایی هەروەك پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی (**مَنْ أَحَبَّ لِقَاءَ اللَّه أَحَبَّ اللَّهُ لِقَاءَهُ وَمَنْ كَرِهَ لِقَاءَ اللَّه كَرِهَ اللَّهُ لِقَاءَهُ** )رواه البخاری ر٦٥٠٨ ومسلم ر ٦٩٩٦.

واتە: هەر کەسێك لیقای خوای پێخۆش بێ خوای گەورەش لیقای وی پێخۆشە وە هەرکەسێك لیقای خوای پێ ناخۆش بێ خوای گەورە لیقای وی پێ ناخۆشە. خوای گەورە لەو کەسانەمان نەکات کە لیقای خوایان پێ ناخۆشە ئامین. زۆر جاردەبینین کە کەسانێك هەن بە مردنی کەسوکاریان تێك دەچن خوانەخواستە توشی بێ ئیمانی دەبن ئەویش لە ئەنجامی نەزانینە بە جیهانی بەرزەخ بەڵام راستیەکەمان باس کرد کە چەند خۆشە.جا باش بزانە کەس لەودونیایە نامینێ هەتاهەتایی دەبێ رۆژێك بمری کەوا بوو دەبێ رازی بین بە قەزاو قەدەری خوای گەورە،وە لەو ئاستە دابین کە فەرمانی خواو پێغەمبەرەکەیﷺ جێ بەجێ بکەین بەتایبەتی لەگەڵ مردووەکانمان نابێ لە گوندێك یان لە گەرەکێك یەك مردوشۆر هەبێ شتێکی زۆر نارەوایە کە بێگانە مردووەکانمان بشوات ئێمەش نا لە زۆربەی سەرچاوەکانی شەرعی باسی ئەوە دەکات کەوا سوننەتە خزمە نزیکەکانی مردووەکە ئەم کارە ئەنجام بدەن چونکە ئەوان زیاتر بەبەزەیین لەگەڵ مردوەکانیان هەروەك لەبابەتی [ باسی ئەو کەسانەی کە مردووشۆرن ] بە ووردی باسمان کردووە.

# [ موسڵمان چ مافی لە سەر یەکتر هەیە]

موسڵمانی بەڕێز :دەبێ بزانین کە موسڵمان مافی لە سەر یەکتر هەیە هەروەك خۆشەویستمان نوری چاومان پێشەوای هەموو مرۆڤایەتی لە فەرمودەیەکدا باس ئەو مافانە دەکا:

قَالَ رسول اللَّه صلى الله عليه وسلم « حَقُّ الْمُسْلِمِ عَلَى الْمُسْلِمِ سِتٌّ ».
قِيلَ مَا هُنَّ يَا رَسُولَ اللَّهِ قَالَ « إِذَا لَقِيتَهُ فَسَلِّمْ عَلَيْهِ وَإِذَا دَعَاكَ فَأَجِبْهُ وَإِذَا اسْتَنْصَحَكَ فَانْصَحْ لَهُ وَإِذَا عَطَسَ فَحَمِدَ اللَّهَ فَسَمِّتْهُ وَإِذَا مَرِضَ فَعُدْهُ وَإِذَا مَاتَ فَاتَّبِعْهُ».صحيح مسلم ر ٥٧٧٨

واتە: موسڵمان شەش مافی لەسەر موسڵمان هەیە .

ئەگەر پێیگەیشتی سەلامی لێ بکە وە ئەگەر بۆ نانخواردن بانگی کردی وەڵامی بدەوە بەدەم بانگەکەیەوە برۆ وە ئەگەرداوای ئامۆژگاری و رێ نیشاندانی لێ کردی بە دڵسۆزیەوە چاکترین ئامۆژگاری بکە وە ئەگەر پشمی و گوتی (الحمدلله)پێ بڵێ (یرحمك لله) خوا رەحمت پێ بکا وە ئەگەر نەخۆشکەوت سەردانی بکە وە ئەگەر مرد شوێنی تەرمەکەی بکەوە بەرێ بکە.

# [گوێڕایەڵی فەرمودەکانی خواو پێغەمبەرەکەی ﷺ]

موسڵمانی تەواو دەبێ گوێڕایەڵی فەرموودەکانی خواوپێغەمبەرەکەی ﷺ بێت ئەگەر نا موسڵمانی تەواو نین وە بزانە کە خوای گەورە چۆن فەرمانمان پێ دەکا بە ملکەچکردنی فەرمانەکانی بە هەمان شێوە فەرمانی پێغەمبەرەکەشی ﷺ لەگەڵ فەرمانی خوی بەستەوە هەروەك لەم ئایەتانەدا روونو ئاشکرایە کە خوای گەورە دەفەرموێ: :{ قُلْ أَطِيعُواْ اللَّهَ وَأَطِيعُواْ الرَّسُولَ فَإن تَوَلَّوْاْ فَإِنَّمَا عَلَيْهِ مَا حُمِّلَ وَعَلَيْكُمْ مَّا حُمِّلْتُمْ وَإِن تُطِيعُوهُ تَهْتَدُواْ وَمَا عَلَى الرَّسُولِ إِلاَّ الْبَلاَغُ الْمُبِينُ }[النور: ٥٤].

{ يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ أَطِيعُواْ اللَّهَ وَأَطِيعُواْ الرَّسُولَ وَأُوْلِي الأَمْرِ مِنكُمْ فَإِن تَنَازَعْتُمْ فِي شَيْءٍ فَرُدُّوهُ إِلَى اللَّهِ وَالرَّسُولِ إِن كُنتُمْ تُؤْمِنُونَ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الآخِرِ ذَالِكَ خَيْرٌ وَأَحْسَنُ تَأْوِيلاً }[النساء: ٥٩]

{ وَأَطِيعُواْ اللَّهَ وَأَطِيعُواْ الرَّسُولَ }[المائدة: ٩٢] .

کەوابوو فەرمانی هەریەکەت نەکرد تۆ موسڵمانی تەواو نی خوا بمانپارێزی ئامین.

جا موسڵمانی بەڕێز: توخوا با هەریەك لە ئێمە پرسیار لە خۆمان بکەین چەند لە فەرموودەکانی پێغەمبەرمانﷺ جێ بەجێ دەکەین وە ئایا ئەگەر پێغەمبەرمانﷺ لە ژیاندا مابایە روحم بە قوربانی بێت رازی دەبوو بەوەی کە ئێمە وا کەم تەرخەمی لە فەرموودەکانی نا والله. بەڵام لە هەمووی ناخۆشتر ئەوەیە کە بەهەر یەکێك بڵی پێغەمبەرمانﷺ ئەو فەرمانەمان پێدەکا بە کردنی، بەبێ فکرکردنەوە لە حوکمی فەرموودەکە دەڵێ سوننەتە، خۆ واجب نیە، سوننەتیش ئەوەیە (يثاب على فعله ولا يعاقب على تركه) واتە: سوننەت ئەگەر بیکەی پاداشت وەردەگری ئەگەر نەتکرد سزا نادرێ.

بەلام ئەم قاعیدە بۆ هەموو فەرموودەكانی پێغەمبەرمانﷺ نابێ (لە كتابی اصول الفقەی عبدالكریم زیدان ص٤٠ ) دا هاتووە هەر كەسێك سوننەت بەشێوەیكی گشتی ترك بكات لەو كاتە وەك فەرزی لێدێت وەك بڵی ژن ناهێنم چونكە ژن نەهێنان دەبێت لە ناوچوونی كۆمەڵگا یاخود واز لە نوێژی جماعت بێنی چونكە پێغەمبەرمانﷺ دەفەرموێ (هَمَمْتُ أَنْ آمُرَ بِالصَّلَاةِ فَتُقَامَ ثُمَّ أُخَالِفَ إِلَى مَنَازِلِ قَوْمٍ لَا يَشْهَدُونَ الصَّلَاةَ فَأُحَرِّقَ عَلَيْهِمْ) رواه البخاري ج٢ ر٦٥٧. واتە : دەمویست فەرمان بكەم بەنوێژكردن وەنوێژەكە بكرایە منیش بەرو ماڵی ئەوكەسانەی كە نوێژی جماعت ناكەن بەسەریاندا بسوتێنم.

جا ئەم فەرمودەیە قاعیدەكە دەگۆرێ بۆ (یثاب علی فعله ویستحق علیه التأدیب والزجر علی تركه) واتە ئەگەر بیكەی پاداشت وەردەگری ئەگەر نەتكرد شایەنی ئەوەیە شەرمەزارو تەمبێ بكرێ لە سەر نەكردنی ئەم سوننەتە. وەهەروەها ئەوە كەسەی سوننەت ترك بكات بەشایەدیش ناچێ هەر وەك لە سەرچاوەكانی شەرعی باس كراوە.

موسڵمانی بەڕێز فەرموودەی تریش هەیە دبێ جێ بە جێ بكرێت واتە واجبە هەر وەك لە سەرەو باسمان كرد كە ئایەتەكانی قورئان فەرمانمان پێ دەكا بە جێ بە جێ كردنی فەرمانی خوا و پێغەمبەرەكەیﷺ. جا ئەگەر جێ بە جێ نەكەی قاعیدەكە دەگۆرێ بۆ (یثاب علی فعله ویعاقب علی تركه) واتە ئەگەر بیكەی پاداشت وەردەگری ئەگەر نەتكرد سزا دەدرێ.

بۆ نمونە خوای گەورە لە قورئان فەرمویەتی (الَّذِينَ يُقِيمُونَ الصَّلَاةَ وَيُؤْتُونَ الزَّكَاةَ)النمل٢ تفسیر الوسیط لسید الطنطاوي.

واتە: ئەوانەی نوێژ دەكەن وەئەوانەی زەكات دەدەن. سید طنطاوی لە تفسیرەكەی باس دەكا كەوا دەبێ نوێژ بە هەموو لایەنەكانی بكرێ. وەك كاتەكان وەژمارەی نوێژەكان لە رۆژێك لەگەڵ ژمارەی ڕەكعەتەكانی لە هەر نوێژێك چەندە. چونكە لە

قورئان باس نەکرایە نوێژ چەند رەکعەتە یان دەستونوێژ چۆن دەشۆری پێغەمبەرمانﷺ فەرموودەی هەیە بۆی ڕوون کردینەوە چۆنە جا ئەم فەرموودەیە دەبێ جێ بە جێ بکرێت وەچەندەها فەرموودەی تر هەنە کە نابێ نەکرێ چونکە بە نەکردنی لە ئیسلام دەردەچی.

هەروەها خوای گەورە دەفەرمووی {وَمَآ آتَاكُمُ الرَّسُولُ فَخُذُوهُ وَمَا نَهَاكُمْ عَنْهُ فَانتَهُواْ }[الحشر: ٧]. تفسير/سراج المنير.

ئەوەی پێغەمبەرﷺ بۆتانی هیناوە لە جێ بە جێ کردنی فەرمانەکان دەبێ بیکەین وە ئەوەی پێ فەرموو بن بە نەکردنی دەبێ وازی لێ بینین. چونکە (لا ينطق عن الهوى) لە خویەوە جی نەکردوەو وەهیجی نەوتوەو مەگەر لە لایەن خوای گەورە نەبێت. جا موسڵمانی بەڕێز کەوا بوو هەر فەرموودەیەکت بینی یان پێان ووتی باش بیری لێبکەوە ئایا لە چ ڕووێکە ئەم فەرموودەیە ئەوجا بڕیار بدە نە وەك تووشی بێ بڕوای ببین خوای گەورە هەموو لایەکمان شارەزا بکە لە فەرموودەکانی پێغەمبەرﷺ.

# [ خێرو پاداشتی مردووشۆر وکفن و ناشتن]

موسڵمانی بەڕێز: جا ئەگەر بزانی خێرو پاداشتی شۆردن وکفن وناشتن چەندە بڕواناکەم ئەوەی ژێر بێت ئەم خێرە لە دەستی خۆی بدات چونکە پێغەمبەرمانﷺ لە دەربارەی ئەم کارە چەند فەرمووودەی دڵخۆشکەری هەیە بەڕاستی گرانبەهایە .
أَخْبَرَنَا أَبُو مُحَمَّد : عَبْدُ اللَّه بْنُ يَحْيَى بْنِ عَبْد الْجَبَّارِ السُّكَّرِيُّ بِبَغْدَادَ أَخْبَرَنَا إِسْمَاعِيلُ بْنُ مُحَمَّدٍ الصَّفَّارُ حَدَّثَنَا عَبَّاسُ بْنِ عَبْد اللَّه التَّرْقُفِيُّ حَدَّثَنَا أَبُو عَبْد الرَّحْمَنِ الْمُقْرِئُ حَدَّثَنَا سَعِيدُ بْنُ أَبِى أَيُّوبَ حَدَّثَنِى شُرَحْبِيلُ بْنُ شَرِيكٍ عَنْ عَلِىِّ بْنِ رَبَاحٍ اللَّخْمِىِّ قَالَ سَمِعْتُ أَبَا رَافِعٍ يُحَدِّثُ أَنَّ رَسُولَ اللَّه -صلى الله عليه وسلم- قَالَ :« مَنْ غَسَّلَ مُسْلِمًا فَكَتَمَ عَلَيْه غَفَرَ اللَّهُ لَهُ أَرْبَعِينَ مَرَّةً ، وَمَنْ حَفَرَ لَهُ فَأَجَنَّهُ أُجْرِىَ عَلَيْه كَأَجْرِ مَسْكَنٍ أَسْكَنَهُ إِيَّاهُ إِلَى يَوْمِ الْقِيَامَةِ ، وَمَنْ كَفَّنَهُ كَسَاهُ اللَّهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ مِنْ سُنْدُسِ وَإِسْتَبْرَقِ الْجَنَّةِ ». سنن الكبير للبيهقى ر٦٩٠٠.

واتە: هەرکەسێ مردووێك بشوا ئەگەر عەیب وکەم و کوڕیەك بەلەشیەوە هەبوو بیشارێتەوە لای خەڵك باسی نەکا خوای میهرەبان لە چل گوناح لە گوناحە گەورەکانی خۆش دەبێ. وە هەر کەسێك گۆڕێك بۆ یەکێك لێدا وەك ئەوەیە خانووێك بە خێر بدات بەیەکێك تا رۆژی کۆتای. وە هەر کەسێك مردووێك کفن بکات خوای گەورە لە رۆژی دوای پۆشی سوندس واستبرەقی بەهشتیانی لەبەردەکا.

وەهەروەها لە فەرموودەکی تردا هاتووە.عَنِ ابْنِ شِهَابٍ أَخْبَرَنِى عَبْدُ الرَّحْمَنِ الأَعْرَجُ أَنَّ أَبَا هُرَيْرَةَ قَالَ قَالَ رَسُولُ اللَّه -صلى الله عليه وسلم- :« مَنْ شَهِدَ الْجَنَازَةَ حَتَّى يُصَلِّىَ عَلَيْهَا فَلَهُ قِيرَاطٌ ، وَمَنْ شَهِدَهَا حَتَّى تُدْفَنَ كَانَ لَهُ قِيرَاطَانِ ». قِيلَ وَمَا الْقِيرَاطَانِ؟ قَالَ :« مِثْلُ الْجَبَلَيْنِ الْعَظِيمَيْنِ »).رواه البخارى ر١٢٦١ ومسلم

ر٢٢٣٢ وغيرهم .

واتە: هەرکەسێ لەلای تەرمێك ئامادەبێ تاوەکو نوێژی لەسەردەکرێ بە ئەندازەی یەك (قیراط) خێری بۆ دەنوسری وە هەرکەسێ لەلای ئامادەبی تا وەکو دەنێژرێ خێری دوو(قیراط)بۆ دەنوسری هاوەڵەکان پرسیاریان کرد دوو (قیراط) چەندە ئەی پیغەمبەری خوا؟ فەرمووی: بە ئەندازەی دوو شاخی گەورەن. وەهەروەها چەندەها فەرموودەی تر هەیە کە باس ئەو خێرە زۆرانە دەکا ئەگەر ئێمە جێ بە جێ بکەین .

# [نەخۆش و خۆ چارەسەرکردن ]

١. (وَيُكْرَهُ تَمَنِّي الْمَوْتِ لِضُرٍّ نَزَلَ بِهِ لاَ لِفِتْنَةِ دِينٍ) ناپەسندە مرۆڤ خۆزگەی مردن بکا بە هۆی زیانێکی گیانی، یان ماڵی: کە تووشی بووبێ بەڵام لە ترسی فیتنەیەك کە تووشی ئایینە کەی ببێ، ناپەسند نیە خۆزگەی مردن بکا: بەم دوعایەی پێغەمبەرﷺ کە دەفەرموێ: [لاَيَتَمَنَّيَنَّ أَحَدُكُمُ الْمَوْتَ لِضُرٍّ نَزَلَ بِهِ، فَإِنْ كَانَ لاَبُدَّ مُتَمَنِّيًا لِلْمَوْتِ فَلْيَقُلْ: اَللَّهُمَّ أَحْيِنِي مَا كَانَتِ الْحَيَاةُ خَيْراً لِي وَتَوَفَّنِي إِذَا كَانَتِ الْوَفَاةُ خَيْراً لِي] رواه الشيخان. البخاري ر ٦٣٥١ ومسلم ر ٦٩٩٠

کەستان خۆزگەی مردن نەکا بە هۆی زیانێك کە تووشی بووبێ، جا ئەگەر هەر پێویست بوو خۆزگەی مردن بکا، با بڵێ: خوایە ئەوەندەی ژیان بۆ من باشتربێ بمژیێنە، هەر کاتێکش مردن بۆ من باشتر بوو بممرێنە.

ئینجا بزانە: خۆزگەیی شەهیدبوون لە ڕێگەی خوا، سوننەتە، هەروەك پێغەمبەرﷺ کە دەفەرموێ:(لوددت أني أقتل في سبيل الله ثم أحيا ثم أقتل ثم أحيا ثم أقتل ثم أحيا ثم أقتل)صحيح البخاري ر ٢٧٩٧.

واتە خۆزگە دەخوازم لە ڕێگای خوابکوژرابامەوزیندوبامە بکوژرابامەوە زیندوبامە.... تا چەند جار ئەمەی دوبارە دەکردوە .

٢. (وَيُسَنُّ التَّدَاوِي) سوننەتە: بۆ مرۆڤی نەخۆش خۆی چارەسەر بکا هەروەك پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ: [تَدَاوَوْا فَإِنَّ اللهَ لَمْ يَضَعْ دَاءً إِلاَّ وَضَعَ لَهُ دَوَاءً غَيْرَ الْهَرَمِ]رواه أصحاب السنن بسند صحيح

خۆتان چارەسەر بکەن بە دەرمان چونکە خوای گەورە هەر دەردێکی دانابێ، دەرمانێکیشی بۆ داناوە جگە لە پیری .چونکە پیری دەرمانی نیە.

٣. (وَيُكْرَهُ إِكْرَاهُهُ عَلَيْهِ) نا پەسندە زۆر لە نەخۆش بکرێ: بۆ خۆ چارەسەرکردنی بەدەرمان چونکە واجب نیە، هەروەك لە سەرچاوەکاندا فەرموویانە، بەڵام لە فەرموودەیەکدا هاتووە: ئەگەر برینێکی وەهای لێ بێ: کە مەترسی لە

ناوچوونی تیٚدابیٚ، ئەو کاتە چارەسەرکردنی واجبەئەگەر بزانیٚ بە چارەسەرکردنی چاك دەبیٚتەوە، هەروەك لە (تحفه)و (الشروانی)دا فەرمووویانە.(رووناکی رب العالمین روونکردنەوە منهاج الطالبین)ص١٥٠.

وەهەروەها نابیٚ زۆری لە نەخۆش بکریٚ بۆ نان خواردن هەروەك پێغەمبەرمانﷺ دەفەرمویٚ: [لا تکرهوا مرضاکم علی الطعام فإن الله یطعمهم ویسقیهم]سنن الترمذي ر٢٠٤٠. وەهەروەها لە(حاشیه الجمل علی المنهج لشیخ الاسلام زکریا الانصاری) ج٣ ص٦٢٤باس کراوە.

# [پێش مردن ]

پێش مردن دەبیٚ ئەمانەی خوارەوە بزاندریٚ:.

١. (لِیُکْثِرْ ذِکْرَالْمَوْتِ) هەموو کەسێکی ژیر دەبیٚ زۆر یادی مردن بکا بەلاٚم بۆ مرۆڤی نەخۆش سوننەتە زیاتر ئەم یادە بکا هەروەك پێغەمبەرمانﷺ دەفەرمویٚ: [أَکْثِرُوا مِنْ ذِکْرِ هَاذِمِ اللَّذَّاتِ] واتە زۆر باسی پچڕێنەری خۆشیەکانی ژیان بکەن کە مردنە. رواه الترمذي ر٢٣٠٧ .وغیره بأسانید صحیحة.

٢. (وَیَسْتَعِدَّ بِالتَّوْبَةِ) هەموو کەسێکی گوناهبار دەبیٚ خۆی بۆ مردن ئامادە بکا بە تۆبەکردن هەروەك خوای گەورە داوامان لیٚدەکا لەم ئایەتە پیرۆزە کە دەفەرموویٚ [یَا أَیُّهَا الَّذِینَ آمَنُوا تُوبُوا إِلَى اللَّهِ تَوْبَةً نَصُوحًا عَسَى رَبُّکُمْ أَنْ یُکَفِّرَ عَنْکُمْ سَیِّئَاتِکُمْ] صفوه التفاسیر / محمد علی الصابونی.التحریم٧.

واتە: ئەی ئەوانەی کە باوەڕتان هێناو بە پەیامی خواو پێغەمبەرەکەیﷺ بگەڕێنەوە بۆ لای خوا لە گوناهەکانتان بە گەڕانەوەیەکی ئێجگاریی ڕەجا وایە پەروەردەکارتان لە گوناهەتان خۆش ببیٚ.

٣. (وَرَدَّ الْمَظَالِمِ) گەڕاندنەوەی ئەو ستەمانەی کە لە مافی خواو مرۆڤدا ئەنجامی داوە وەك قەزاکردنەوەی نوێژو زەکاتو ڕۆژوو و حەجو بەجێهێنانی کەففارەت و نەزر ئەمانە مافی خوای گەورەیە. وەهەروەها بە دانەوەی مافی مرۆڤ وەك پارە

خواردن یاخود ئازاردانی...هتد ئەگەر ئەوستەمانەی نەگەڕانەوە خاوەنەکانیان لە دونیا بزانە لە قیامەت جی بەسەر دێت هەروەك پێغەمبەرمانﷺ دەفەرمووێ «أَتَدْرُونَ مَا الْمُفْلِسُ ». قَالُوا الْمُفْلِسُ فِينَا مَنْ لاَ دِرْهَمَ لَهُ وَلاَ مَتَاعَ. فَقَالَ « إِنَّ الْمُفْلِسَ مِنْ أُمَّتِى يَأْتِى يَوْمَ الْقِيَامَةِ بِصَلاَةٍ وَصِيَامٍ وَزَكَاةٍ وَيَأْتِى قَدْ شَتَمَ هَذَا وَقَذَفَ هَذَا وَأَكَلَ مَالَ هَذَا وَسَفَكَ دَمَ هَذَا وَضَرَبَ هَذَا فَيُعْطَى هَذَا مِنْ حَسَنَاتِهِ وَهَذَا مِنْ حَسَنَاتِهِ فَإِنْ فَنِيَتْ حَسَنَاتُهُ قَبْلَ أَنْ يُقْضَى مَا عَلَيْهِ أُخِذَ مِنْ خَطَايَاهُمْ فَطُرِحَتْ عَلَيْهِ ثُمَّ طُرِحَ فِى النَّارِ»صحيح مسلم ر٦٧٤٤.

واتە: دەزانن کێ مایە پوچە (موفلیس)ە ووتیان ئەوەی کە پارەو سامانی نە بێت پێغەمبەرمانﷺ فەرمووی موفلیس ئەو کەسیە لە ئومەتەکەم دێ لە بۆ رۆژی دوای بە نوێژو رۆژی و زەکات بەڵام جوێنی بەو دایە بوختانی بەو کردیە ماڵی وی خواردیە خوێنی ئەوی رشتیە بە نا حق ئازاری خەڵکی دایە ئەوجا جاکەکانی دەدرێتە ئەو وە دەدرێتە ئەوەی تر تا جاکەکان نامێنێ ئەوجا گوناحی حق خوراوەکان وەردەگرنو بەسەرویدا دەدەنەوە پاشان بۆ ناو دۆزەخ فرێ دەدرێ.خوا پەنامان بدات ئامین .

٤. (وَالْمَرِيضُ آكَدُ) مرۆڤی نەخۆش دەبێ ئەمانی باسمانکرد لە مافی خواو مرۆڤدا زووتر جێبەجێ بکات چونکە مردن لەوی نزیك بویتەوە.

٥. (وَيُضْجَعُ الْمُحْتَضَرُ لِجَنْبِهِ الأَيْمَنِ إِلَى الْقِبْلَةِ عَلَى الصَّحِيحِ) سوننەتە: ئەو کەسەی لە سەرەمەرگدایە لە سەر تەنیشتی ڕاستەی بەرەو قیبلە درێژ بکرێ لە سەر فەرموودەی ڕاست، ئینجا ئەگەر نەگونجا، ئەو کاتە لە سەر تەنیشی چەپە بەرەو قیبلە دەکرێ. (ڕووناکی رب العالمین ڕوونکردنەوە منهاج الطالبین)ص١١٠.



هەروەك لەم وێنە(١)دا دیارە

٦. (فَإنْ تَعذَّرَ لِضيقِ مَكَانٍ وَنَحْوِه أُلْقِيَ عَلَى قَفَاهُ وَوَجْهُهُ وَأَخْمُصَاهُ لِلْقِبْلَة) جا ئەگەر لە سەر تەنیشتی چەپەش زەحمەت بوو چونکە شوێنەکە تەنگ بوو هەروەها لەبەر هۆیەکی تر: وەك تەنیشتەکانی زامدار بێ، ئەو کاتە لە سەر پشت درێژ دەکرێ دەمو چاو و بنە پێیەکانی بەرەو قیبلە دەکرێن، واتە: شتێك لە بن پاشە سەری دادەنرێ، تاکو ڕووی بکەوێتە قیبلە [عَنْ أبي قَتادَةَ ﷺ أنَّ البراء بن معرور ﷺ أَوْصَى أَنْ يُوَجَّهَ إِلَى الْقِبْلَةَ لَمَّا اُحْتُضِرَ، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ أَصَابَ الْفِطْرَةَ] رواه البيهقي ر ٦٨٤٣ وصححه الحاكم. (البراء) كە (صحابة) بوو لە کاتی سەرەمەرگدا وەسیەتی کرد ڕووی لە قیبلە بکەن، جا پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ڕەوشتێکی پاکی ئیسلامی وەدەست هێناوە. (ڕووناکی رب العالمین ڕوونکردنەوە منهاج الطالبین) ص١١٠.

٧. (وَيُلَقَّنُ الشَّهَادَةَ بلاَ إلْحَاحٍ) سوننەتە: لە حاڵەتی سەرەمەرگدا شەهادەی تەنها (لاَإلَهَ إلاَّاللهُ)ی لە لا بگوترێ (مُحَمَّدٌ رَسُولُ الله)ی لەگەڵ نەگوترێ.

لەکتابی (فقه العبادات) الشافعی دا هاتووە کە دەڵێ واسوننەتە ئەو تلقینە نەرمترین مەحرەمەکانی مردووەکە بگرێتە ئەستۆ ، تاکو بەزەیی پێدا بێ وا باشە میراتگر نەبێ نە وەك لە بەر ئارەزوی میرات لە تلقین دەرچێ واتە لە جیاتی تلقیت باسی میرات بکە بەڵام ئەگەر لە میراتگر زیاتر ئامادە نەبوون ئەو کاتە کامە بەزەیترە با ئەو تلقینی بەدات. ∴ نابێ ئەو تلقینە بە بەردەوامیش لە لای بەگوترێ، وە هەروەها فەرمانیشی پێنەکرێ: بڵێ: (لاَإِلَهَ إلاَّاللهُ). نەوەك لە ڕقو قینەوە بڵێ: نایڵێم. یان قسەیەکی تری ناشیرین بکا، بەڵکو ماوەیەك بێدەنگ دەبێ، ئینجا (لاَإِلَهَ إلاَّاللهُ)ی لە لا دەگوترێتەوە، تاکو گوێی لێ ببێو بیڵێ وە هەروەها بزانن کامە لەلای ئەو نەخۆشە خۆشەویستە با ئەو تلقینی بدات تاکو گوێڕایەڵێ بکا بە ووتنی. ئینجا ئەگەر جارێك گوتی: (لاَإِلَهَ إلاَّاللهُ)، هیچی تر بۆی دووبارە ناکرێتەوە، مەگەر لە دوای گوتنەکەی قسەیەکی تر بکا، ئەو کاتە بۆی دووبارە دەکرێتەوە، تاکو ببێتە ئاخیر قسەی لە دونیادا، چونکە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: [لَقِّنُوا مَوْتَاكُمْ لاَإِلَهَ إلاَّاللهُ] رواه مسلم ر ٢١٦٢, واتە: لە لای ئەو نەخۆشانەتان کە نزیکە بمرن،

(لاَإِلَهَ إلاَّاللهُ) بلێن، [مَنْ كَانَ آخرُ كَلاَمه لاَإِلَهَ إلاَّاللهُ، دَخَلَ الْجَنَّةَ] رواه ابوداود باسناد حسن ر٣١١٨. واته: هەر كەسێك دوا گۆتەی لە دونیادا (لاَإِلَهَ إلاَّاللهُ) بێ، دەچێتە بەهەشت .

موسڵمانی بەڕێز ئەوەی ڕابردوو دەربارەی نەخۆشی موسڵمانان بوو، بەڵام ئەگەر نەخۆشی كافر چاوەڕوانی ئیسلامبوونی لێ دەكرا واجبە: هەردوو شەهادەی پێ بگوترێ، واتە: پێی بگوترێ: بڵێ: (أَشْهَدُ أَن لاَّإِلَهَ إلاَّاللهُ، وَأشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّداً رَسُولُ الله). تاكو موسڵمان ببێ‌و بە موسڵمانی بمرێ.

[عَنْ أَنَس ﷺ: كَانَ غُلاَمٌ يَهُوديٌّ يَخْدُمُ النَّبيَّ ﷺ فَمَرض فَأَتَاهُ النَّبيُّ ﷺ يَعُودُهُ فَقَعَدَ عنْدَ رَأْسه فَقَالَ: أَسْلمْ. فَنظَرَ إلَى أَبيه وَهُوَ عندَهُ؟ فَقَالَ: أَطعْ أَبَاالْقَاسم،فَأَسْلَمَ، فَخَرَجَ النَّبيُّ ﷺ يَقُولُ: اَلْحَمْدُ للّه الّذى أَنْقَذَهُ منَ النَّار] رواه البخاری ر ١٣٥٦، كوڕێكی جولەكە خزمەتی پێغەمبەری ﷺ دەكردو نەخۆش كەوت، جا پێغەمبەر ﷺ هاتە سەردانی‌و لە لای سەری دانیشتو فەرمووی: ببە موسڵمان. كوڕەكەش تەماشەیەكی باوكی خۆی كرد، باوكەكەشی گوتی: گوێڕایەڵی باوكی قاسم ببە- واتە: بە قسەی پێغەمبەر ﷺ بكە- ئینجا كوڕەكە موسڵمان بوو و پێغەمبەر ﷺ چووە دەرەوەو دەیفەرموو: (اَلْحَمْدُ للّه الّذى أَنْقَذَهُ منَ النَّار) سوپاس بۆ ئەو خوایەی ئەو كوڕەی لە ئاگر ڕزگار كرد. (ڕووناكی رب العالمین ڕوونكردنەوە منهاج الطالبین)ص١١١.

٨. (وَيُقْرَأُ عنْدَهُ (يس)) سوننەتە: لە حاڵەتی سەرەمەرگدا سوڕەتی (یاسین)ی لەلا بخوێندرێ، پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: [إقْرَأُوا عَلى مَوْتَاكُمْ: يس]رواه ابوداود ر ٣١٢١، سوڕەتی (یاسین) لە سەر ئەو نەخۆشانەتان بخوێنن كە نزیكە بمرن.

هەروەها سوننەتە سوڕەتی (الرعد)ش بخوێندرێ, بەڵام ئاگاداربە: هەركاتێك نەخۆشەكە گیانی دەرچوو و مرد، دروست نیە: قورئانی لە سەر بخوێندرێ تا دەشۆرێ، چونكە بە هۆی مردن غوسلی واجب بووە، هەروەك لە (شرح الحاوی)دا فەرموویەتی، هەروەها سوننەتە: پێش مردن كەم كەمەش ئاوی بدرێتێ، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەكاندا فەرموویانە. (ڕووناكی رب العالمین ڕوونكردنەوە منهاج الطالبین)ص١٢١.

عن عائشة قالت : وجع رسول الله صلى الله عليه وسلم ذلك اليوم فاضطجع في حجري فدخل علي رجل من آل أبي بكر وفي يداه سواك أخضر فنظر رسول الله صلى الله عليه وسلم نظرا عرفت أنه يريده قلت يا رسول الله أتحب أن أعطيك هذا السواك قال نعم قالت فأخذته فألنته ثم أعطيته إياه فاستن به كأشد ما رأيته استن بسواك قبل ثم وضعه ووجدت رسول الله صلى الله عليه وسلم يتفل في حجري فذهبت أنظر في وجهه فإذا بصره قد شخص وهو يقول بل الرفيق الأعلى من الجنة قلت خيرت فاخترت والذي بعثك بالحق قالت وقبض رسول الله صلى الله عليه وسلم. سنن النسائي الكبرى ر ٧١٠٤.

واتە: دایكی ئیمانداران بۆمان باس دەكە كە پێغەمبەرﷺ ئەو رۆژەی كە ئازاری بوو لە ژوورەكەی من بوو پیاوێك هات ژوورێ لە كەسوكاری ابی بكر سیواكی لەدەستی بوو پێغەمبەرﷺ تەماشای كرد زانیم كە داوادەكات وتم ئەی پێغەمبەری خواﷺ پێت خۆشە بۆت بێنم ووتی بەڵێ جا بۆم نەرم كرد دامە دەستی بەڵام هیچ جارێك پێغەمبەرمﷺ وا نەدی بوو زۆر وا سیواك بكات جا داینا پاشان جووم تەماشای روخسارم كرد دەیووت بل الرفیق الأعلی من الجنة وتم سوێند بێ بەو خوای كە تۆی نارد جاكترینت هەڵبژارد جا گیانی پاكی بە خوای گەورە سپارد.

جا موسڵمانی بەرێز كەوابوو لەم فەرموودەدا ئەوەمان بۆ دەردەكەوێت كە سیواك سوننەت پێش مردن وە هەندێك لە زاناكان دەفەرموون روح كێشان ئاسان دەكات.

٩. (وَلْيُحْسِنْ ظَنَّهُ بِرَبِّهِ سُبْحَانَهُ وَتَعَالَى) با نەخۆشەكە دڵو بۆچوونی خۆی جوان بكا دەرهەق بەخوای خۆی، واتە: دڵ و بۆچوونی ئەوها بێ: كە خوای گەورە لێ خۆش دەبێ‌و ڕەحمی پێ‌دەكا، پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ: [لاَيَمُوتُ أَحَدُكُمْ إِلاَّ وَهُوَ يُحسِنُ الظَّنَّ بِاللَّهِ تَعَالَى] رواه مسلم ر ٧٤١٢، هەر یەكێكتان تەنها لەو حاڵەتەدا بمرێ: كە دڵو بۆچوونی خۆی جوان بكا دەرهەق بەخوای گەورە. كەوابو: سوننەتە: ئەوانەی لە لای نەخۆشەكەنە، ئەوانیش دڵخۆشی بكەنو تەماعی ڕەحمی خوای بخەنە ناو دڵ، هەروەك لە سەرچاوەكاندا فەرموویانە.

# [پاش مردن ]

هەر كاتێك یەكێك مرد پێویستە ئەمانەی بۆبكرێت.

١. (فأذا مات غُمِّضَ وَشُدَّ لَحْيَاهُ بعصَابَة) ئەگەر مرد چاوەكانی دەچوقێندرێنەوە [عَنْ أُمِّ سَلَمَةَ رَضِی اللهُ عَنْهَا: دَخَلَ رَسُولُ اللهِﷺ عَلَى أَبِی سَلَمَةَ‌ﷺ وَقَدْ شَقَّ بَصَرُهُ، فَأَغْمَضَهُ ثُمَّ قَالَ: إِنَّ الرُّوحَ إِذَا قُبِضَ تَبِعَهُ الْبَصَرُ]رواه مسلم ر ٢١٦٩، پێغەمبەرﷺ هاتە لای (أبی سلمه) كە مردبو و چاویشی كرابۆوە، جا پێغەمبەرﷺ چاوەكانی بۆ چوقاندەوەو فەرمووی: كاتێ گیان لە لاشە وەردەگیرێ، چاو بە دوایدا دەڕوانێ ئایا بۆ كوێ دەڕوا.ئینجا بزانە: سوننەتە: لە حاڵەتی چوقاندنەوەدا بڵێ: (بِسْمِ اللهِ وَعَلَى مِلَّةِ رَسُولِ اللهِﷺ). هەروەك لە سەرچاوەكاندا فەرموویانە. هەردوو شەویلەكانی مردووەكە دەبەسترێن بە پارچە پەڕۆكێكی پانو بە لای سەرەوەی سەری دەبەسترێتەوە چونكە ئەگەر دەمی كراوە بێ، شتی دەڕواتە ناوەوەی. (رووناكی رب العالمین ڕوونكردنەوە منهاج الطالبین)ص١٢١. هەروەك لە وێنە(٢)دا دیارە



٢. (وَلُيِّنَتْ مَفَاصِلُهُ) نەرم كردنى جومگەكانى ، واتە: باسكەكانى بەرەو قۆڵەكانى دەبردرێنو دەگەڕێندرێنەوە، قاچەكانیشى بەرەوە ڕانەكانىو دەبردرێنو دەگەڕێندرێنەوە، تاكو لاشەى نەرم بێ بۆ شۆردنیش ئاسان بێ. (ڕووناكى رب العالمین ڕوونكردنەوە منهاج الطالبین)ص١٢١.

٣. (وَوُضِعَ عَلَى بَطْنِهِ شَيْءٌ ثَقِيلٌ) سوننەتە: شتێكى گران لە سەر زگى مردووەكە دابنرێ وەك شیر یاخود ئاسن، هەروەك (الحاوى الكبير الماوردى) ج٣ ص٤ باس كراوە. واتە بەئەندازەى كاشیەك تاكو فوو نەدرێو هەڵنەئاوسێ، بەڵام نابێ قورئانو كتێبەكانى ئایینى لە سەر دابندرێ، هەروەك لە سەرچاوەكاندا فەرموویانە.

هەر وەك لە وێنەد(٣)دا دیارە



٤. (وَسُتِرَ جَمِيعُ بَدَنِهِ بِثَوْبٍ خَفِيفٍ) داپۆشینى هەموولاشەى مردوو لەسەرى تاكو بنى پێى بە بەتانیەكى تەنك یاخود سەرجەف پاش جل لەبەر داكەندنى واتە نە وەك پاش مردنى شتى پیسى لێ دەرچووبێ. هەروەك لە(الحاوى الكبير الماوردى) ج٣ ص٨ باس كراوە تاكو ئامادەبێت بۆ شۆرین.

٥. (وَوُضِعَ عَلَى سَرِيرٍ وَنَحْوِهِ) سوننەتە:مردووەكە لە سەر تەختەیەك دابندرێ یان

شتێكی تری وەك تەختە بێت لەبەر ئەوەی تاكو لاشەی لەسەر خاك تێك نەچێ وە لە زیندەوریش بە دوور بێت .هەروەك لە(الحاوی الكبیر الماوردی) ج ٣ ص٨ باس كراوە
هەر وەك لە وێنە(٤)دا دیارە



٦. (وَوُجِّهَ لِلْقِبْلَةِ كَمُحْتَضَرٍ) سوننەتە:پاش مردن ڕووی مردووەكە لە قیبلە بكرێت ئینجا بزانە: ئەگەر گونجا لە سەر تەنیشتێكی درێژ بكرێ، ئەوە شتە گرانەكەی بە داوێك، یان بە پەڕۆكێك لە سەر زگی دەبەسترێ، ئەگەر نا: لە سەر پشت بەرەو قیبلە دەكرێ و شتە گرانەكەشی لە سەر دادەندرێ، هەروەك لە (تحفە)و (نهایة)دا ڕوون كراوەتەوە. هەر وەك لە وێنەی (٥)دا



٧. (وَيَتَوَلَّى ذَلِكَ أَرْفَقُ مَحَارِمِهِ) سوننەتە: ئەو کارانەی ڕابردوو بگرێتە ئەستۆ نەرمترین مەحرەمەکانی مردووەکە، تاکو بەزەیی پیّدا بیّ، ئینجا پیاو بۆ پیاو، ئافرەت بۆ ئافرەت، هەروەك لە سەرچاوەکاندا فەرموویانە. (ڕووناکی رب العالمین ڕوونکردنەوە منهاج الطالبین)ص١٣١.

٨. (يُبَادَرُ بِقَضَاءِ دَيْنِ الْمَيِّتِ وَوَصِيَّتِهِ) ئیمامی (النواوی) دەفەرمویّ سوننەتە پەلە بکریّ بە دانەوەی قەرزی مردووەکە، جا ئەگەر بگونجیّ، با پێش شۆردنو واجبەکانی تر قەرزەکەی بدەنەوە، چونکە پێغەمبەرﷺ دەفەرمویّ: [نَفْسُ الْمُؤْمِنِ مُعَلَّقَةٌ بِدَيْنِهِ حَتَّى يُقْضَى عَنْهُ]حديث صحيح رواه الترمذیّ ر ١٠٧٨، گیانی مرۆڤی ئیماندار بە هۆی قەرزەکەی قەدەغە دەکریّ: لە چونە بەهەشت تا قەرزەکەی بۆ دەدرێتەوە. جائەگەر نەگونجا زوو قەرزەکان بدرێنەوە، ئەو کاتە خزمێکی مردووەکە با داوا لە خاوەن قەرزەکان بکا: قەرزەکان حەوالەی ئەستۆی وی بکەن، تاکو لە ئەستۆی مردووەکە لابچیّ، هەروەك لە سەرچاوەکاندا فەرموویانە هەروەها سوننەتە: بە پەلە وەسیّتەکانی جیّبەجیّ بکەن، تاکو زوو خێرەکەی بگاتیّ.

٩. (وَيَجُوزُ لأَهْلِ الْمَيِّتِ وَنَحْوِهِمْ تَقْبِيلُ وَجْهِهِ) دروستە بۆ خزمەکانی مردووەکەو ئەوانەی وەك ئەوانیش: کە دۆستەکانیەتی ڕووی مردووەکە ماچ بکەن [عَنْ عَائِشَةَ رَضِي اللهُ عَنْهَا: أَنَّ أَبَابَكْرٍ﷛ قَبَّلَ وَجْهَ النَّبِيِّﷺ بَعْدَ مَوْتِهِ]رواه البخاری ر ٤٤٥٧ ، ئیمامی (أبوبكر) ڕووی پێغەمبەریﷺ ماچ کرد لە دوای وەفاتی. (ڕووناکی رب العالمین ڕوونکردنەوە منهاج الطالبین)ص١٥٠.

١٠. (وَلاَ بَأْسَ بِالإِعْلاَمِ بِمَوْتِهِ لِلصَّلاَةِ وَغَيْرِهَا) هیچ نا پەسند نیە بە هۆی بانگەوازی کردن بە مردنی مردووەکە تاکو خەڵك بزانیّو بێن نوێژی لە سەر بکەن جگە لە نوێژیش: وەك دوعا بۆ کردنو ناشتنو ئەو جۆرە شتانە .

١١. (بِخِلاَفِ نَعْيِ الْجَاهِلِيَّةِ) بە پێچەوانەی پێداهەڵگوتنی سەردەمی نەفامی پێش ئیسلام، چونکە پێدا هەڵگوتن نا پەسندە، واتە نابیّ بانگەوازەکە بە سەردولکەو

پێداهەلگۆتنێکی نا شەرعی بێت بەسەر مردووەکە وەك بە هاوارەوە بڵێ پشتەوپەنامان مرد یان بڵێ سەرداری ماڵمان مرد...هتد. ئەو جۆرە پێداهەلگۆتنانە لە بێ باوەڕی نزیکمان دەکاتەوە خوا بە دوورمان بخات لەو جۆرە کەسان ئامین.

# [چۆن مردوو دەشۆرێ]

موسڵمانی بەڕێز: ئەم بابەتە دەتوانم بڵێم لە هەمووان گرینگترە جا زۆر بە ووردی بخوێنەوە.

**تێبینی:** لەسەرەتای شۆردن و تا لە گۆرنانیش نابێ بە هیچ شێوەیەك عەورەتی مردوو دیار بێت یان دەستی لێ بدرێت بەبێ پەرۆك لەدەست کردن یاخود دەستەوانە لەبەر ئەوەی حەرامە.

جا مامۆستا عبدالکریم مدرس بەم شیعرە باسی مردوو شۆر دەکات(ڕێگای بەهەشت بە هۆنراوەو پەخشان لاپەرە ٢٥)

شەخسی مردوو شۆر با زۆر ئەمین بێ
جێگەی باوەڕو خاوەنی دین بێ
وەزعێکی باشی لە مردوو بینی
بیگێرێتەوە زۆر بە ئەمینی
عەیبێکی لێ دی سڕی داپۆشی
مەگەر فاسق بێ و بۆ شەڕ تێکۆشێ
ئەوە باس بکا بۆ موسڵمانان
ئەر نەبێ بەهۆی فیتنەی نیوانیان

١. (وَيُبَادَرُ بِغُسْلِه إِذَا تُيُقِّنَ مَوْتُهُ ) سوننەتە: پەلە بکرێ بە شۆردنی مردووەکە هەر کاتێك مردنەکەی بێگومان بوو، بەڵام ئەگەر مردنەکەی بێگومان نەبو، وەك

کتوپڕ مردبێ، یان ترسابێ، یان له شوێنێکی بەرز کەوتبێ، ئەو کاتە دروست نیە پەلە بکرێ، بەڵکو واجبە: چاوەڕوان بکرێ تا دڵنیایی دەبێ: کە مردوە، هەروەك لە سەرچاوەکاندا فەرمووبانە.

٢. (وَغُسْلُهُ وَتَكْفِينُهُ وَالصَّلاَةُ عَلَيْهِ وَدَفْنُهُ فُرُوضُ كِفَايَةٍ) شۆردنی مردووەکە کفن کردنی نوێژ لە سەرکردنی ناشتنی هەر چواریان واجبن بە (فَرْضُ الْكِفَايَةِ)، بە (إجماع)ی زانایانی ئیسلام: لە سەر گشت کەسێك کە هەواڵی مردنەکەی گەیشتبێتێ هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەکاندا فەرموویانە. جا موسڵمانی بەڕێز بزانە کە پێغەمبەرمانﷺ چە دەفەرموێ " فُرِضَ عَلَى أُمَّتِي غَسْلُ مَوْتَاهَا وَالصَّلاَةُ عَلَيْهَا وَدَفْنُهَا" الحاوی الکبیر فی فقه الشافعی ج ٣ ص ٦.: واتە فەرزە لە سەر ئومەتم شۆردنی مردووەکانیان و نوێژ لەسەر کردنیان و لە گەڵ لە گۆڕنان.الماوردی دەڵێ کەوا بوو فەرزە لە سەر هەموو موسڵمانان شۆردن ونوێژ و لە گۆڕنان بزانن. ئەم داواکاریە هەمووان دەگرێتەوە بەڵام هەر کەسێ پێ هەڵسا فەرزە کە لە سەروانیتر لا دەچێ .جا بزانە پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ فەرزە واتە دەبێ بشزانی جۆن مردوو دەشۆرێ یا کفن دەکرێت ویان جۆن لە گۆڕدەنرێت لەبەر ئەوەی ئەگەر لە شوێنیك بوی کەس شارەزای تیدا نەبوو واتە نەخوێندەواربوون ئەو کاتە چی دەکەی ئەگەر نەزانی.

٣. (وَأَقَلُّ الْغُسْلِ تَعْمِيمُ بَدَنِهِ بَعْدَ إِزَالَةِ النَّجَسِ) کەمترینی شۆردنی مردووکە واجبەکەی پێ پێك بێ ئەمەیە بە ئاوێکی پاك گشت لاشەی بگرێتەوە، یەك جار لە دوای لادانی پیسی لە لاشەی مردووەکە، ئەگەر پیسی پێوە بێ .

٤. (وَلاَ تَجِبُ نِيَّةُ الْغَاسِلِ فِي الأَصَحِّ) نیەتهێنانی مردووشۆرەکە واجب نیەو مەرج نیە بۆ دروستبوونی شۆردنەکە لە فەرموودەی ڕاستتردا، چونکە مەبەست لەم شۆردنە پاکی یە،

٥. (فَيَكْفِي غَرَقُهُ أَوْ غُسْلُ كَافِرٍ) بە فەرموودەی بێ‌هێز ئەوەندە بەسە: مردووەکە نقوم ببێتە ناو ئاو یان کافرێك بیشۆرێ، چونکە مەبەستەکە پێك دێ.

٦. (قُـلْـتُ: الصَّحِيحُ الْمَنْصُوصُ: وُجُوبُ غُسْلِ الْغَرِيقِ وَاللهُ أَعْلَمُ) ئیمامی(النواوی) دەفەرموێ دەقی فەرمودەی ڕاست ئەمەیە واجبە مرۆڤی لە ئاودا خنکاو بشۆرێ (وَاللهُ أَعْلَم) چونکە شۆردنەکە لە سەر ئێمە واجبە، کەوابو: بە کرداری ئێمەی زیندوو نەبێ دروست نابێ، کەواتە: دروستە منداڵی فامیدەش مردووەکە بشۆرێنێ، هەروەك لە (تحفة)و (نهاية)دا فەرموویانە.

٧. (وَالأَكْمَلُ وَضْعُهُ بِمَوْضِعٍ خَالٍ مَسْتُورٍ عَلَى لَوْحٍ) تەواوترینی شۆردنی مردووکە سوننەتەکانیشی ئەنجام بدرێن ئەمەیە بۆ شۆردن لە شوێنێکی چۆڵ دابندرێ، جگە لە مردووشۆرەکەو یارمەتیدەرەکانی، کەسی تری لێ نەبێ شوێنەکە داپۆشراو بێ‌و خەڵك نەیبینێ، کەوابو: وا باشترە لە ژێر بانێکدا بشۆرێ لە سەر تەختێك، یان تاتەشۆرێك بشۆرێ، تاکو پرۆشکە ئاوەکانی پێ‌نەکەونەوە.

٨. (وَيُغَسَّلُ فِي قَمِيصٍ) سوننەتە: لە ناو کراسێکی کۆندا بشۆرێ، واتە: دەستەکانی بباتە ژێر کراسەکە، جا ئەگەر کراس دەست نەکەوت، یان نەگونجا تێیدا بشۆرێ، ئەو کاتە واجبە: عەورەتی مردووەکە بە جلێکی تر داپۆشرێ، چونکە لە مردووشۆرەکەش‌و لە یارمەتیدەرەکەشی حەرامە: تەماشای عەورەتی مردووەکە بکەن،

٩. (بِمَاءٍ بَارِدٍ) سوننەتە: بە ئاوێکی سارد مردووەکە بشۆرێ، بەڵام ئەگەر مردووەکە چڵکن بوو، یان زۆر سەرما بوو، ئەوکاتە ئاوەکە نەختێك گەرم دەکرێ. هەروەك لە (المجموع)و(اعانة)دا باس کراوە. (رووناکی رب العالمين ڕوونکردنەوە منهاج الطالبين)ص١٤١.

١٠. (وَيُجْلِسُهُ الْغَاسِلُ عَلَى الْمُغْتَسَلِ مَائِلاً إِلَى وَرَائِهِ) سوننەتە: مردووشۆرەکە مردووەکە دابنیشێنێ لە سەر شوێنی مردووشۆردن سوننەتە: لە دانیشتاندنەکەدا نەختێك بەرەو لای پشتەوە خواری بکاتەوەوەهەر وەك لە وێنەی(٦)دا دیارە

١١. (وَيَضَعُ يَمِينَهُ عَلَى كَتِفِهِ) دەستە ڕاستەکەی خۆی لە سەر شانی ڕاستەی مردووەکە دابنێ. سەیری وێنەی(٦)بکە



١٢. (وَإِبْهَامَهُ فِي نُقْرَةِ قَفَاهُ) پەنجە گەورەکەشی لە ناو نەویایی پشت ملی دابنێ، تاکو سەری بە لادا نەچێ سەیری وێنەی (٦) بکە

١٣. (وَيُسْنِدُ ظَهْرَهُ إِلَى رُكْبَتِهِ الْيُمْنَى) پشتی مردووەکەش پاڵ وە نەژنۆ ڕاستەکەی خۆی بدا. سەیری وێنەی (٦) بکە

١٤. (وَيُمِرُّ يَسَارَهُ عَلَى بَطْنِهِ إِمْرَاراً بَلِيغاً لِيَخْرُجَ مَا فِيهِ) دەستەچەپەی خۆی بە سەر زگی مردووەکەدا بێنێ بە پێداهێنانێکی زۆر تاکو ئەو پیسیەی لە زگی دایە بێتە دەرەوە، نەوەك لە دوای شۆردن بێتە دەرەوە، ئینجا لەو حاڵەتەشدا یارمەتیدەرەکە ئاوێکی زۆر بە سەر پیسیەکە دادەکا، تاکو زوو لابچێو بۆنی نەبێ، هەروەك لە سەرچاوەکاندا فەرموویانە. سەیری وێنەی (٤) بکە

١٥. (ثُمَّ يُضْجِعُهُ لِقَفَاهُ) ئینجا لەدوای دەست پێداهێنانەکە،مردووەکە لە سەر پشت درێژ دەکا،بەڵام لای سەری بەرزتر بێ .

١٦. (وَيَغسِلُ بِيَسَارِهِ وَعَلَيهَا خِرقَةٌ سَوأَتَيهِ) ئینجا بە دەستەچەپەی خۆی تارەتی مردووەکە دەکا لەو حاڵەتەدا واجبە: دەستەکەی لە ناو پەڕۆکێك، یان دەستەوانەیەك دابنێ هەردوو عەورەتەکانی مردووەکە دەشوا، واتە: پێشەوەو پشتەوەی و دەوروبەرەکەیان چونکە حەرامە: بە دەستی ڕووت دەست لە عەورەتی مردووەکە بدا، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەکاندا فەرموویانە.

**ئاگاداری:** پاش پاکردنەوەی ناو زگی مردووەکە دەبێ پەڕۆکی سەر عەورەتی مردووەکە بگۆڕێ بە پارچە پەڕۆکێکی تر پاك بێت تاکو ئامادە بێت بۆ تەواو کردنی شۆردنەکە لەبەر ئەوەی پیس بووە.

١٧. (ثُمَّ يَلُفُّ أُخرَى) ئینجا دەستەوانەیەك یان پارچە پەڕۆکێکی تر لە دەستی دەکا کە پاك بێت.

١٨. (وَيُدخِلُ أُصبُعَهُ فَمَهُ وَيُمِرُّهَا عَلَى أَسنَانِهِ)پەنجەی شادەی دەستە چەپی خۆی دەنێتە ناو دەمی مردووەکە بە سەر ددانەکانی دا دێنێ و بە ئاو بۆی پاك دەکاتەوە.ئینجا بزانە: واباشە بە دار سیواك ددانی مردووەکە پاك بکاتەوە هەروەك لە(حاشية الجمل) باس کراوە. لەبەر ئەوەی سیواك کردن خێری زۆرە.

**ئاگاداری:** نابێ ددانەکانی لێك بکرێتەوە واتە شەویلاکی سەروەوخوارەو ئەگر توندبوو هەروەك لە (الشرواني)دا فەرموویەتی.

١٩. (وَيُزِيلُ مَا فِي مِنخَرَيهِ مِن أَذًى) بە پەنجەی بچکۆڵەشی پیسی ناو لووتی لادەبا.

٢٠. (وَيُوَضِّئُهُ كَالحَيِّ) سوننەتە: دەستنوێژێکی تەواو بۆ مردووەکە بگرێ وەکو دەستنوێژی مرۆڤی زیندوو: لە واجبو سوننەتەکاندا ئینجا بزانە: لە سەر مردووشۆرەکە واجبە نیەتی دەستنوێژی سوننەت بۆ مردووەکە بێنێ، هەروەك لە (الشرواني )دا فەرموویەتی. هەر وەك لەم وێنەدا دیارە(٧)



٢١. (ثُمَّ يَغْسِلُ رَأْسَهُ ثُمَّ لِحْيَتَهُ بِسِدْرٍ وَنَحْوِهِ) ئینجا لە دوای دەستنوێژ سەری مردووەکە دەشوا ئینجا ڕیشی مردووەکە دەشوا بەسیدر یان شتێکی وەك سیدر کەف بکا وەك سابوون. هەر وەك لە وێنە(٨ )و (٩)دا دیارە.






٢٢. (وَيُسَرِّحُهُمَا بِمِشْطٍ وَاسِعِ الأَسْنَانِ بِرِفْقٍ) سەرو ڕیشی مردووەکە شانە دەکا بە شانەیەکی ددان بەرین بە نەرمیو لەسەرخۆ. کەوابو حەرامە بەشانەیەکی نێوان وورد ببێتە ئەوی موی سەرو ریشی زۆر لێبکرێتەوە هەروەك لە(الشرواني)دا فەرموویەتی. وە لە فەرموودەیەك پێغەمبەرمانﷺ پێمان دەفەرمێ کە چۆن مردووەکانمان سەرو ریشیان رێك و پێك بکەین. «اصْنَعُوا بِمَيِّتِكُمْ مَا تَصْنَعُونَ بِعَرُوسِكُمْ» الحاوى الكبير الماوردى ج٣ص٢٢. واتە چە لە زاوا دەکەن لە ڕووی جوانی ریش و ڕووخساری لە کاتی ژن هێنانی واش لە مردووەکەتان بکەن.

٢٣. (وَيَرُدُّ الْمُنْتَتَفَ إِلَيْه) ئەو موانەی هەڵکەندراون دەگەڕێندرێنەوە لای مردووەکەو لە ناو کفنەکەی دادەندرێ، واتە: فڕێ نادرێن.

٢٤. (وَيَغْسِلُ شِقَّهُ الأَيْمَنَ) لای ڕاستەی مردووەکە دەشوا، لە پێشەوەڕا: لە ئەستۆی تا پێ‌ی. هەر وەك لە وێنەی (١٠)دا دیارە.

٢٥. (ثُمَّ الأَيْسَرَ) ئینجا لای چەپەی دەشوا، لە پێشەوەڕا: لە ئەستۆی تا پێ‌ی

٢٦. (ثُمَّ يُحَرِّفُهُ إِلَى شِقِّهِ الأَيْسَرِ) ئینجا مردووەکە وەردەگێڕێ بۆ سەر تەنیشی چەپەی. نابێ بە هیچ شێوەك عەورەتی مردوو دیار بێت تا کۆتای کفن کردنی لەبەر

ئەوەی حرامە. هەر وەك لە وێنەی (١١) دا دیارە.



٢٧. (فَيَغْسِلُ شِقَّهُ الأَيْمَنَ مِمَّا يَلِي الْقَفَا وَالظَّهْرَ إِلَى الْقَدَمِ) تەنیشی ڕاستەی مردووەکە دەشوا لە پشتەوەڕا، لای پشت ملو پشتی تا دەگاتە پێی مردووەکە. سەیری وێنە (١١)بکە.

٢٨. (ثُمَّ يُحَرِّفُهُ إِلَى شِقِّهِ الأَيْمَنِ فَيَغْسِلُ الأَيْسَرَ) ئینجا مردووەکە وەردەگێڕێتە سەر تەنیشتی ڕاستەی لای چەپەی دەشوا لە پشتەوەڕا: لە پشت ملی تا پێی، هەر وەك لە وێنەی (١٢)دا دیارە ئینجا بزانە: حەرامە مردوو لە سەر زگ واتە: لای دەمو چاو درێژ بکرێ، هەروەك لە سەرچاوەکاندا فەرموویانە. وەهەروەها ابی هریرە ڕەزای خوای لەسەر بێت دەفەرمووی (رأى رسول الله صلى الله عليه و سلم مضطجعا على بطنه فقال إن هذه ضجعة لا يحبها الله)رواه الترمذي ر٢٧٦٨. واتە پێغەمبەرﷺ یەکەکی بینی لە سەر زگ پاڵی داوەتەوە پێ فەرموو خوا ئەو کارەی خۆش ناوی لە فەرموودەیەکی تر دا دەفەرموی لێان توڕەیە کەوا بوو بۆ زیندو ومردوو وەك یەکە والله اعلم.



٢٩. (كَذَلِكَ فَهَذِهِ غَسْلَةٌ) ئەو شۆردنانەی دوای شۆردنی سەرو ڕیشی تا ئێرە تەنها بە یەك شۆردن دەژمێردرێو واجبەکەشی پێ تەواو دەبێ.

٣٠. (وَيُسْتَحَبُّ ثَانِيَةٌ وَثَالِثَةٌ) سوننەتە شۆردنێکی تری دووەمو سێیەم، بەو شێوەی باسمان کرد، جا ئەگەر بە سێ جار پاك نەبۆوە، واجبە: زیاتر بشۆرێ، سوننەتە شۆردنەکانیش تاك بن .

٣١. (وَأَنْ يُسْتَعَانَ فِي الأُولَى بِسِدْرٍ أَوْ خِطْمِيٍّ ثُمَّ يُصَبُّ مَاءٌ قَرَاحٌ مِنْ فَرْقِهِ إِلَى قَدَمِهِ بَعْدَ زَوَالِ السِّدْرِ) سوننەتە لەو سێ جارانەدا لە شۆردنەکەی یەکەمیاندا یارمەتی ئاوەکە بدرێ بە یەکێك لەو دووانە، واتە: یان بە شتێکی تر، کە کەفی هەبێو چڵك لا ببا: وەکو سابوونو تایت ئینجا لە هەر جارێك لەو سێ شۆردنانە ئاوێکی پاکی بێ گەرد بە سەر مردووەکەدا دەکرێ لە تۆقی سەریەوە تا پێی مردووەکە پاش لابردنی سیدر، یان کەفەکەی سابوون بە ئاو، واتە: لابردنی کەفەکە بە شۆردن ناژمێردرێو بە بەر واجب ناکەوێ، چونکە بە هۆی کەفەکە ئاوەکە گۆڕاوەو لە کار کەوتوە، هەروەك لە سەرچاوەکاندا فەرموویانە. سەیری وێنە (٩)بکە. (ڕووناکی رب العالمین ڕوونکردنەوە منهاج الطالبين)ص١٦١.

٣٢. (وَأَنْ يَجْعَلَ فِي كُلِّ غَسْلَةٍ قَلِيلَ كَافُورٍ) سوننەتە: لە گشت جارێکی شۆردنەکەدا لە ناو ئاوە بێ گەردەکە بکا کەمێکی کافوور، کە ئاوەکە نەگۆڕێو لە کاری نێخێ، تاکو لاشەی مردووەکە توند بکاو بە هۆی بۆنەکەشی مێشو مەگەز لێ دوور کەوێتەوە، ئینجا بەڵگەی ئەو شێوەیەی ڕابردوو، ئەم حەدیسە: [عَنْ أُمِّ عَطِيَّةَرَضي اللهُ عَنْهَا: قَالَ رَسُولُ اللهِﷺ فِي غَسْلِ ابْنَته: إِبْدَأْنَ بِمَيَامِنِهَا وَمَوَاضِعِ الْوُضُوءِ مِنْهَا] وفي رواية: [إغسِلْنَهَا ثَلاثاً أَوْ خَمْساً أَوْ أَكْثَرَ مِنْ ذَلِكَ بِمَاءٍ وَسِدْرٍ وَاجْعَلْنَ فِي الآخِرَةِ كَافُوراً، فَلَمَّا فَرَغْنَا آذَنَّاهُ فَأَلْقَى إِلَيْنَا حِقْوَهُ، فَقَالَ: أَشْعِرْنَهَا إِيَّاهُ، فَضَفَرْنَا شَعْرَهَا ثَلاثَةَ قُرُونٍ وَأَلْقَيْنَاهَا خَلْفَهَا] صحيح البخاري ر١٢٥٤، پێغەمبەرﷺ دەربارەی شۆردنی (زينب)ی کیژی، فەرمووی: لە شۆردندا دەست بە لای ڕاستەکانی بکەنو

خێرتره له سەر باریككردنی وەك له سونەنی الترمذي هاتووه ژماره ١٠٤٩ :حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ بَشَّارٍ حَدَّثَنَا عَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ مَهْدِيٍّ حَدَّثَنَا سُفْيَانُ عَنْ حَبِيبِ بْنِ أَبِي ثَابِتٍ عَنْ أَبِي وَائِلٍ أَنَّ عَلِيًّا قَالَ لِأَبِي الْهَيَّاجِ الْأَسَدِيِّ أَبْعَثُكَ عَلَى مَا بَعَثَنِي بِهِ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَنْ لَا تَدَعَ قَبْرًا مُشْرِفًا إِلَّا سَوَّيْتَهُ وَلَا تِمْثَالًا إِلَّا طَمَسْتَهُ قَالَ وَفِي الْبَاب عَنْ جَابِرٍ قَالَ أَبُو عِيسَى حَدِيثُ عَلِيٍّ حَدِيثٌ حَسَنٌ وَالْعَمَلُ عَلَى هَذَا عِنْدَ بَعْضِ أَهْلِ الْعِلْمِ يَكْرَهُونَ أَنْ يُرْفَعَ الْقَبْرُ فَوْقَ الْأَرْضِ قَالَ الشَّافِعِيُّ أَكْرَهُ أَنْ يُرْفَعَ الْقَبْرُ إِلَّا بِقَدْرِ مَا يُعْرَفُ أَنَّهُ قَبْرٌ لِكَيْلَا يُوطَأَ وَلَا يُجْلَسَ عَلَيْهِ( ت ).

ئینجا بزانه: له حەدیسێكی (صحیح)دا هاتوه: [گۆڕی پێغەمبەرﷺ سەرگۆڕ كراوه]. له حەدیسێكی تری (صحیح)دا هاتوه: [گۆڕی پێغەمبەرﷺ سەرباریك بوو]. جا ئیمامی (البیهقی) وەڵامی داوەتەوە: كه له سەرەتاوه سەرگۆڕ كرابو، بەڵام دیوارەكانی ڕوخانو له سەردەمی (أُموی)یەكاندا سەرباریك كرا، هەروەك له (المجموع) و(تحفه)دا فەرموویانه.

١٨. (وَلاَ يُدْفَنُ إِثْنَانِ فِي قَبْرٍ إِلاَّ لِضَرُورَةٍ، فَيُقَدَّمُ أَفْضَلُهُمَا) دروست نیه: دوو مردوو، یان زیاتر له ناو یەك گۆڕدا بنێشترێن، ئەگەر دیوارێك له نێوانیاندا نەكرێته پەرده، واته: ئەگەر دیوارێك له نێوان هەردوو مردووەكەدا كرا پەرده، ئەوكاته دروسته، هەروەك له (تحفه)دا ئاماژەی بۆ كردوه تەنها له بەر ناچاری نەبێ: وەك مردوو زۆر بێو زەحمەت بێ هەر یەكەیان له گۆڕێكدا بنێشترێ، ئەو كاته دروسته: دوو مردوو، یان زیاتر له ناو یەك گۆڕدا بنێشترێن،جا لەو حاڵەتەدا كام مردوو گەورەتره، ئەو وەپێش دێخرێ بۆ لای قیبله[عَنْ هشامِ: قَالَ النَّبِيُّ ﷺ فِي قَتْلَى أُحُد: إِجْعَلُوا الرَّجُلَيْنِ وَالثَّلاثَةَ فِي الْقَبْرِ، قِيلَ: فَأَيُّهُمْ يُقَدَّمُ؟ قَالَ أَكْثَرُهُمْ قُرْآناً] رواه أصحاب السنن بسند صحيح مثل سنن ابی داود ٣٢١٧ وسنن النسائی ر٢٠١١، دەربارەی شەهیدەكانی (أحد)، پێغەمبەرﷺ فەرمووی: دوو پیاو و سێ پیاو له ناو گۆڕێك دابنێن، گوترا: كامەیان له لای قیبله بێ؟ فەرمووی: ئەوەی زۆرتر قورئانی خوێندوه.ئینجا بزانه: لەو حاڵەتەدا نێرینه له

**لای قیبلە دادەندرێ، ئینجا ئافرەت، لە نێرینەکانیش: گەورە وەپێش منداڵ دێخرێ، هەروەها لە ئافرەتانیش: گەورە وەپێش منداڵ دێخرێ، بەڵام بە هەموو جۆرێك باوك وەپێش کوڕی خۆی دێخرێو دایکیش وەپێش کیژی خۆی دێخرێ، ئینجا سوننەتە: لە نێوان ئەم مردووەو مردووەکەی تردا خۆڵ دابندرێو بکرێتە پەردە، هەروەك لە سەرچاوەکاندا فەرمووڕیانە.**

**ئاگاداری:** ئەگەر گۆڕێك هەڵکەندراو گەیشتە ئێسقانی مردووێکی تر، تەماشا دەکرێ: ئەگەر چاڵەکە تەواو هەڵنەکەندرابو، واجبە: گۆڕەکە پڕ بکرێتەوەو وازی لێ بێنن. بەڵام ئەگەر چاڵەکە تەواو هەڵکەندرابو، ئەوجا ئێسقانەکان دەرکەوتن، ئەو کاتە ئێسقانەکان لە لایەکی گۆڕەکە دادەندرێنو مردووەکەش تێیدا دەنێشترێ، واتە: دروست نیە مردووەکە لە سەر ئێسقانەکان بنێشترێ، چونکە حەرامە: مردووێك لە سەر مردووێکی تر بنێشترێ. مەگەر گشت ئێسقانەکانیشی ڕزی بن، ئەو کاتە دروستە، کەواتە: هەر کاتێك مردووەکە هیچ ئێسقانی نەمانو گشتی بووە خۆڵ، دروستە: گۆڕەکەی هەڵبکەندرێو مردووێکی تری تێدا بنێشترێ، بەو مەرجەی گۆڕەکە هی (صحابە)و پیاوچاکە ناودارەکان نەبێ، چونکە هەڵکەندنەوەی گۆڕی ئەوانە، لە دوای ڕزینیش قەدەغەیەو حەرامە، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەکاندا فەرمووڕیانە.

١٩. (**وَلاَ يُجْلَسُ عَلَى الْقَبْرِ وَلاَ يُوطَأُ**) نابێ، واتە: ناپەسندە دانیشتن لە سەر گۆڕی موسوڵمانان، هەروەها ناپەسندە پاڵی پێ بدرێ، یان لە سەری پاڵ بدرێتەوە نابێو ناپەسندە پێی لە سەر دابندرێ: جا لە سەری بڕوا، یان لە سەری ڕابوەستێ، چەند زانایەکیش فەرمووڕیانە: ئەوانەی ڕابردوو گشتی حەرامن، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەکاندا فەرمووڕیانە, پێغەمبەرﷺ دەفەرمویێ: [**لأَنْ يَجْلِسَ أَحَدُكُمْ عَلَى جَمْرَةٍ فَتُحْرِقَ ثِيَابَهُ فَتَخْلُصَ إِلَى جِلْدِهِ خَيْرٌ لَهُ مِنْ أَنْ يَجْلِسَ عَلَى قَبْرٍ**]رواه مسلم ٢٢٩٢، یەکێکتان لە سەر پشکۆیەکی ئاگر دابنیشێو جلەکانی بسوتێنێ تا دەگاتە پیستەکەی، باشترە لەوەی لە سەر گۆڕی موسوڵمانێك دابنیشێ.ئینجا بزانە: ئەگەر

ناچار بوو: وه‌ك نه‌گاته‌ گۆڕی مردووه‌كه‌ی خۆی، یان نه‌ده‌گونجا گۆڕێكی تر له‌ ته‌نیشتی هه‌ڵبكه‌نێ، یان گۆڕه‌كه‌ گۆڕی كافرێك بوو، له‌و حاڵه‌تانه‌دا ناپه‌سند نیه‌، هه‌روه‌ك له‌ زۆربه‌ی سه‌رچاوه‌كاندا فه‌رموویانه‌.

٢٠. (وَيَقْرُبُ زَائِرُهُ كَقُرْبِهِ مِنْهُ حَيًّا) ئه‌و كه‌سه‌ی زیاره‌تی مردووێك ده‌كا، سوننه‌ته‌: له‌ گۆڕه‌كه‌ی نزیك ببێته‌وه‌ به‌و ئه‌ندازه‌یه‌ی له‌ حاڵه‌تی زیندووه‌تی دا لێی نزیك ده‌بۆوه‌.

٢١. (وَيَحْرُمُ نَقْلُ الْمَيِّتِ إِلَى بَلَدِآخَرَ) حه‌رامه‌ گوازتنه‌وه‌ی مردوو، پێش ناشتنی له‌ شوێنی مردنی بۆ شوێنێكی تر، هه‌رچه‌ند مردووه‌كه‌ش تێك نه‌چێ‌و نه‌گۆڕێ .

(ڕووناكی رب العالمین ڕوونكردنه‌وه‌ منهاج الطالبين)ص١٦١.

٢٢. (وَقِيلَ يُكْرَهُ إِلاَّ أَنْ يَكُونَ بِقُرْبِ مَكَّةَ أَوِالْمَدِينَةِ أَوْ بَيْتِ الْمَقْدِسِ نَصَّ عَلَيْهِ) ناپه‌سنده‌ بگوازرێته‌وه‌ مه‌گه‌ر مردووه‌كه‌ له‌ نزیك (مكه‌)ی پیرۆز بێ یان له‌ نزیك (مدینه‌)ی پێغه‌مبه‌رﷺ یان له‌ نزیك (بیت المقدس) بێ، ئه‌و كاته‌ سوننه‌ته‌: بگوازرێته‌وه‌ بۆ یه‌كێك له‌و سێیانه‌ ئیمامی شافیعی وه‌های فه‌رمووه‌، چونكه‌ ئه‌و سێ جێگایانه‌ ڕێزی تایبه‌تییان هه‌یه‌. كه‌وابو: ئه‌گه‌ر مردووه‌كه‌ وه‌سیه‌تی كرد: بگوازرێته‌وه‌ بۆ یه‌كێك له‌و سێیانه‌، واجبه‌: وه‌سێته‌كه‌ی جێبه‌جێ بكرێ، به‌و مه‌رجه‌ی لاشه‌كه‌ی نه‌گۆڕێ‌و بۆن نه‌بێ، هه‌روه‌ك له‌ (نهاية)و(مغني)دا فه‌رموویانه‌.به‌ڵام ئه‌گه‌ر بۆ شوێنێكی تر جگه‌ له‌و سێیانه‌ وه‌سیه‌تی كرد: بگوازرێته‌وه‌، دروست نیه‌ وه‌سێته‌كه‌ی جێبه‌جێ بكرێ، هه‌روه‌ك له‌ (المجموع)و (تحفه‌)دا فه‌رموویانه‌.ئینجا بزانه‌: له‌ هه‌ر حاڵه‌تێكدا گوازتنه‌وه‌ی مردووه‌كه‌ دروست بێ، واجبه‌: له‌ پێش گوازتنه‌وه‌دا بشۆرێ‌و كفن بكرێ‌و نوێژی له‌ سه‌ر بكرێ، هه‌روه‌ك له‌ زۆربه‌ی سه‌رچاوه‌كاندا فه‌رموویانه‌.

٢٣. (وَنَبْشُهُ بَعْدَ دَفْنِهِ لِلنَّقْلِ وَغَيْرِهِ حَرَامٌ إِلاَّ لِضَرُورَةٍ: بِأَنْ دُفِنَ بِلاَ غُسْلٍ أَوْ فِي أَرْضٍ أَوْ ثَوْبٍ مَغْصُوبَيْنِ أَوْ وَقَعَ فِيهِ مَالٌ) هه‌ڵكه‌ندنه‌وه‌ی گۆڕ له‌ دوای ناشتنی مردووه‌كه‌ بۆ گوازتنه‌وه‌ی مردووه‌كه‌ بۆ شوێنێكی تر هه‌روه‌ها له‌ به‌ر هۆیه‌كی تری

ناشەرعیش گشتی حەرامە، چونکە سوکایەتی کردنە بە مردووەکە تەنها لە بەر ناچاری نەبێ، ئەو کاتە دروستە وەك بە بێ‌غوسل نێشترابێ، واتە: نەشۆرابێ وتەیەممومیش نەکرابێ بە تەیەممومێکی دروستبوو، ئەو کاتە واجبە: مردووەکە بهێندرێتە دەرەوە و بشۆرێ و نوێژی جەنازەی لە سەر بکرێ، بەو مەرجەی لاشەی تێك نەچوبێ‌و بۆن نەبوبێ، ئەگینا: واجب نیە، هەروەك لە سەرچاوەکاندا ڕوون کراوەتە یان لە خاکێکی داگیرکراودا نینشترابێ، یان بەکفنێکی داگیرکراو، یان دزراو کفن کرابێ، لەو حاڵەتانەشدا واجبە: مردووەکە بهێندرێتە دەرەوە، هەر چەند لاشەکەشی تێك چوبێ‌و بۆن بوبێ، تاکو مافەکە بدرێتەوە خاوەن ماف، جا ئەگەر خاوەن مافەکە چاوپۆشی کردو گەردەنی ئازاد کرد، یان بە تۆڵە وەرگرتن ڕازی بوو، ئەو کاتە حەرامە: بهێندرێتە دەرەوە، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەکاندا ڕوون کراوەتەوە. یان گۆڕەکە ماڵێکی بکەوێتە ناو: جا پارە بێ، یان شتێکی تر، ئەو کاتە ئەگەر خاوەن ماڵەکە داوا بکا واجبە: گۆڕەکە هەڵبکەندرێ‌و ماڵەکە بهێندرێتە دەرەوە، هەروەها ئەگەر مردووەکە لە کاتی زیندووەتی دا پارە، یان زێڕی کەسێکی تری قووتدابێ‌و خاوەنەکەشی داوای بکا، واجبە: بهێندرێتە دەرەوە، وورگی هەڵبدرێ‌و ماڵەکەی لێ دەربهێنن‌و بیدەنەوە خاوەن ماف، بەڵام ئەگەر پارەکە، یان زێڕەکە، یان هەر ماڵێکی تری خۆی بە زیندووەتی قووتدابێ، ئەو کاتە دروست نیە: نە بهێندرێتە دەرەوەو نە وورگیشی هەڵبدرێ بۆ دەرهێنانی ماڵەکەی، هەروەك لە سەرچاوەماندا فەرموویانە، واتە: تا مردووەکە بە تەواوی دەرزێ، ئەو کاتە دروستە: ماڵەکە لە گۆڕەکە دەربهێنن، هەروەك لە (تحفە)دا فەرموویەتی.

**ئاگاداری/** یەکەم: لەو مەسەلەیە بۆمان ڕوون بۆوە: کە دروست نیە لاشەی مردووی موسوڵمان، یان ئەندامێکی لەت بکرێ تاکو وانەی پزیشکی لە سەر بخوێندرێ، یان بۆ ئەوەی پلاتین‌و ئەو جۆرە شتە بە نرخانە لە لاشەی مردووەکە دەربهێندرێن، چونکە لەتکردنی لاشەی مردوو بەبێ حەقێکی شەرعی حەرامە، لە

(المجموع)دا بەڵگەی بەوە هێناوەتەوە: کە پێغەمبەرﷺ دەفەرمویّ: [كَسْرُ عَظْمِ الْمَيِّتِ كَكَسْرِهِ حَيًّا]رواه ابوداود بسندصحيح ر ٣٢٠٩، شکاندنی ئێسقانی مردوو، وەکو شکاندنی ئێسقانەکەیەتی بە زیندووەتی. واتە: حەرامە. ئینجا بزانە: دروستە دەرهێنانی ددانی زێڕ لە دەمی مردوو، چونکە ئەو لە تکردنو ئازاردانەی تیّ‌دانیە، وَاللهُ أَعْلَم.

دووەم: هەر کاتێك ئافرەتێك مردو کۆرپەیەکی زیندووی لە زگی دا بوو، ئەوە دوو حاڵەتی هەیە:

حاڵەتی یەکەم: ئەگەر ژینی کۆرپەکەی ڕەچاو دەکرا: وەك تەمەنی شەش مانگ‌و بە سەرەوەتر بیّ، ئەو کاتە واجبە: زگی ئافرەتەکە هەڵبدڕنو کۆرپەکەی لیّ دەربێنن، چونکە ڕزگارکردنی ئادەمیزادی بیّ‌گوناە لە مردن واجبە، خوایگەورە دەفەرمویّ: [وَمَنْ أَحْيَاهَا فَكَأَنَّمَا أَحْيَا النَّاسَ جَمِيعًا] مائدة ٣١. هەر کەسێك ئادەمیزادێك لە مردن ڕزگار بکا، خێری وەك هەموو خەڵکی ڕزگار کردبیّ وایە.

حاڵەتی دووەم: ئەگەر ژینی کۆرپەکەی ڕەچاو نەدەکرا: وەك تەمەنی لە شەش مانگ کەمتر بیّ، ئەو کاتە دروست نیە: زگی ئافرەتەکە هەڵبدڕیّ‌و کۆرپەکەی بهێندرێتە دەرەوە، چونکە سوکایەتی کردنێکی بیّ سوودە بە مردووەکە، هەروەها دروستیش نیە: ئافرەتەکە بنێشتریّ تا کۆرپەکەی لە ناو زگی دا بەخۆی لە جولە دەکەویّ‌و دەمریّ، واتە: نابیّ بە هیچ هۆیەك کۆرپەکەی بمرێندریّ، چونکە بە هیچ شێوەیەك کوشتنی ئادەمیزادی بیّ‌گوناە دروست نیە، هەروەك لە سەرچاوەکاندا ئەومەسەلەیە ڕوون کراوەتەوە.

٢٤. (أَوْ دُفِنَ لِغَيْرِالْقِبْلَةِ لاَ لِلتَّكْفِينِ فِي الأَصَحِّ ) یان مردووەکە بەرەولایەکی تری جگە لە قیبلە نێشترابیّ، ئەو کاتەش واجبە: گۆڕەکە هەڵبکەندریّ‌و مردووەکە ڕوو لەقیبلە بکریّ، بەو مەرجەی تێك نەچوبیّ، ئەگینا: واجب نیە، هەروەك لە باسی ناشتندا ڕوونمان کردەوە. بەڵام بۆ کفن کردن ناهێندرێتە دەرەوە، واتە: ئەگەر

به کفننەکراوی نێشترابێ لە فەرموودەی ڕاستتردا، چونکە مەبەست لە کفن کردن داپۆشینی مردووەکەیە، وا ئێستاش بە هۆی ژێرخاککردن داپۆشراوە.ئینجا بزانە: ئەگەر گۆڕەکە لافاوی دەگەیشتێ، یان نێماوی لێ‌پەیدا بوو، یان هەر هۆیەکی تری شەرعی هەبێ، دروستە: مردووەکە دەربهێندرێ‌و لە گۆڕێکی تردا بنێشترێ، هەروەك لە سەر چاوەکاندا فەرمووبانە [عَنْ جابر بن عَبْداللهرَضِي اللهُ عَنْهُما: دُفِنَ مَعَ أَبِي رَجُلٌ آخَرُ فِي قَبْرٍ، ثُمَّ لَمْ تَطِبْ نَفْسِي أَنْ أَتْرُكَهُ مَعَ الآخَرِ، فَاسْتَخْرَجْتُهُ بَعْدَ سِتَّةِأَشْهُرٍ فَإِذَا هُوَ كَيَوْمِ وَضَعْتُهُ هَيْئَةً غَيْرَ أُذُنِه] رواه البخاري ر ٣١٥١، وفي روايه له: [فَجَعَلْتُهُ فِي قَبْرٍ عَلَى حِدَةٍ]. لە یەك گۆڕدا پیاوێك لەگەڵ (عبدالله)ی باوکم نێشترا واتە: لە شەهیدەکانی (أحد) منیش دڵم بەوە خۆش نەبو ئەوها واز لە باوکم بێنم، ئینجا لە دوای شەش مانگ باوکمم لە گۆڕەکە دەرهێناو بە تەنهایی لە گۆڕێکی تردا ناشتمەوە، لاشەی باوکم هەروەك ئەو ڕۆژەی ناشتبوم ساغ بوو، جگە لە گوێ یەکی نەبێ.ئینجا بزانە: ئەو حەدیسەش بەڵگەیە: کە لاشەی شەهیدان نارزێ، هەروەك لە (تَذْكِرَة القُرْطُبِي)دا ڕوون کراوەتەوە، وَاللهُ أَعْلَم.

# [ باسی (تلقین)ی مردوو ]

(وَيُسَنُّ أَنْ يَقِفَ جماعَةٌ بَعْدَ دَفْنِه عِنْدَ قَبْرِهِ سَاعَةً يَسْأَلُونَ لَهُ التَّثْبِيتَ) سوننەتە کۆمەڵێك بمێننەوە لە دوای ناشتنی مردووەکە لە لای گۆڕەکەی سەعاتێك، واتە: ماوەیەك بۆ مردووەکە لە خوا بپاڕێنەوە: تاکو وەڵامی پرسیارەکانی ناو قەبر بداتەوە، واتە: بڵێن: خوایە لە گوناهەکانی خۆش ببە، خوایە وەڵامی ڕاست بێنە سەر زوبانی، خوایە وەڵامەکانی پێ بڵێ.

موسڵمانی بەڕێز: تلقین لە ئیسلام بە دوو شێوە هاتووە .

یەکەم : پێش مردنە هەروەك باسمان کرد لە بەشی [پێش مردن ]دا.

دووەم : تلقین لەپاش شاردنەوەی لە گۆڕدا ئەم بەشە زیاتر دوعا دەگرێتەوە بۆ مردووەکە، هەروەك پێغەمبەرمانﷺ دەفەرمووێ [عَنْ عُثْمَانَ‌ؓ: كَانَ النَّبِيُّﷺ إِذَا فَرَغَ مِنْ دَفْنِ الْمَيِّتِ وَقَفَ عَلَيْهِ فَقَالَ: إِسْتَغْفِرُوا لأَخِيكُمْ وَاسْئَلُوا لَهُ التَّثْبِيتَ فَإِنَّهُ الآنَ يُسْأَلُ]رواه ابوداود ر ٣٢٢٣ وغيره بإسناد جيد، واتە:کاتی پێغەمبەرﷺ لە ناشتنی مردوو تەواو دەبو، لە سەر گۆڕەکەی ڕادەوەستاو دەیفەرموو: تکای لێخۆشبوونی گوناە بۆ براتان بکەنو لە خوا بپاڕێنەوە: وەڵامی ڕاست بهێنێتە سەر زوبانی، چونکە ئێستا پرسیاری لێ‌دەکرێ. بەلام بەداخەوە دوعاکە زۆر بە کەمی دەکرێت بۆ مردووەکە، کەچی ڕاستی سوننەتەکە ئەوەیە کە دوعای بۆ بکرێت.

هەروەها دەتوانی ئەم سێ بەڵگەش بینین دەربارەی ئەو تلقینەی کە ئێستا دەکرێت پاش ناشتنی لە لای سەری مردووەکە کەسێك دادەنیشێت پێ دەڵێت (لە یادت نەچێ کە شاهیدیت دەدا بە تاکو تەنهای خوا لەگەل پێغەمبەرەکەیﷺ تۆ رازی بووی بە خواو بە ئیسلام و ...هتد. ئەمەش بەڵگەکانە:

بەڵگەی یەکەم : **سئل احمد رضي الله عنه عن تلقين الميت في قبره فقال ما رأيت أحدا يفعله إلا أهل الشام قال وكان أبو المغيرة يروي فيه عن أبي بكر بن أبي مريم عن أشياخهم أنهم كانوا يفعلونه وقال القاضي وأبو الخطاب يستحب ذلك وروينا فيه حديثا عن أبي أمامة أن النبي صلى الله عليه وسلم قال إذا مات أحدكم فسويتم عليه التراب فليقم أحدكم عند راس قبره ثم ليقل يا فلان بن فلانة فإنه يسمع ولا يجيب ثم ليقل يا فلان ابن فلانة الثانية فيستوي قاعدا ثم ليقل يا فلان ابن فلانة فإنه يقول أرشدنا يرحمك الله ولكن لا تسمعونه فيقول اذكر ما خرجت عليه من الدنيا شهادة ألا لا إله إلا الله وأن محمدا عبده ورسوله وأنك رضيت بالله ربا وبالإسلام دينا وبمحمد صلى الله عليه وسلم نبيا وبالقرآن إماما فان منكرا ونكيرا يتأخر كل واحد منهما فيقول انطلق فما يقعدنا عند هذا وقد)** الكافي في فقه ابن الحنبل ج١ ص ٢٧٢ .

بەڵگەی دووەم: يسن تلقين الميت بعد الدفن لما روى سعيد بن عبد الله الأزدي قال : شهدت أبا أمامة رضي الله عنه وهو في النزع فقال : إذا أنا مت فاصنعوا بي كما أمر رسول الله صلى الله عليه و سلم فقال : ( إذا مات أحد من إخوانكم فسويتم التراب على قبره فليقم أحدكم على رأس قبره ثم ليقل : يا فلان ابن فلانة فإنه يستوي قاعدا ثم يقول : يا فلان ابن فلانة فإنه يقول : أرشدنا رحمك الله ولكن لا تشعرون . فليقل : اذكر ما خرجت عليه من الدنيا شهادة أن لا إله إلا الله وأن محمدا عبده ورسوله وأنك رضيت بالله ربا وبالإسلام دينا وبمحمد نبيا وبالقرآن إماما) مجمع الزوائد ومنبع الفوائد: ر٣٩١٨ والايضاح والتبين بمسألة التلقين ص١٦١-١٦٢ .

بەڵگەی سێیەم : عن سعيد الأزدي قال شهدت أبا أمامة وهو في النزع فقال لي يا سعيد إذا أنا مت فافعلوا بي كما أمرنا رسول الله ( صلى الله عليه وسلم ) قال لنا رسول الله ( صلى الله عليه وسلم ) إذا مات أحد من إخوانكم فنثرتم عليه التراب فليقم رجل منكم عند رأسه ثم ليقل يا فلان بن فلان فإنه يستوي جالسا ثم ليقل يا فلان بن فلانة فإنه يقول أرشدنا رحمك الله ثم ليقل اذكر ما خرجت عليه من دار الدنيا شهادة أن لا إله إلا الله وأن محمدا عبده ورسوله وإنك رضيت بالله عز وجل ربا وبمحمد ( صلى الله عليه وسلم ) نبيا وبالإسلام دينا وبمحمد ( ٣ ) ( صلى الله عليه وسلم ) نبيا فإنه إذا فعل ذلك أخذ منكر ونكير أحدهما بيد صاحبه ثم يقول له أخرج بنا من عند هذا ما نصنع به وقد لقن حجته ولكن الله عز وجل حجته دونهم فقال له رجل يا رسول الله فإن لم أعرف أمه قال انسبه إلى حواء. اخرجه ابن عساكر في (تاريخ دمشق ج ٢٤ ص ٧٢-٧٣).

جا بزانە تەلقينی مردوو لەچەرخی یەکەمی ئیسلامیەوە لەناو موسڵماناندا هەبووە واتە لە سەردەمی سەحابەوپێشەواو زانایانی سەلەفی هەرە گەورەو ناودارەکانی ئیسلام هەبووەو کاری پێکراوە وە بۆ خوێندەواری شارەزای موسڵمان ئەوەندە بەسە بڵێین پێشەوای هەر چوار مەزەب، ئیمامی ئەبو حەنیفەو مالیك و شافیعی و ئەحمەدی

کوڕی حەمبەل ڕەزای خوایان لەسەر بێ تەلقینی مردوویان بە (مستحب ومندوب و سنه) زانیوه. لە کتابی (بەرێکردنی مردوو بۆ جیهانی داهاتوو) لە باسی تلقین بەدرێژی باس کراوە.

هەروەها سوننەتە: نەختێك قوڕئانیش لە لای گۆڕەکەی بخوێنن، ئیمامی (شافعی) دەفەرموێ: (ئەگەر هەموو قوڕئان لە لای گۆڕەکەی ختم بکەن جوانەو خێرترە). هەروەك لە (المجموع)و(الاذكار)دا گێڕاویەتیەوە. هەم [وَعَنْ ابنِ عُمَرَ رَضِي اللهُ عَنْهُما: أنَّهُ إسْتَحَبَّ أنْ يُقْرَأَ عَلَى الْقَبْرِ بَعْدَ الدَّفْنِ أوَّلُ سُورَةِالْبَقَرَةِ وَخاتِمَتُها] رواه البيهقي ر٧٢٤٢ بإسناد حسن، (ابن عمر) بە خێری دەزانی: سەرەتای سووڕەتی (البقره)و کۆتاییەکەی لە دوای ناشتنی مردووەکە لە سەر گۆڕەکەی بخوێندرێ.

ئینجا بزانە: هەر مردووێك بالغو عاقڵ بوبێ، سوننەتە: لە دوای ناشتن (تلقین) بدرێ، واتە: بەڵام ئەگەر منداڵێك بمرێ، یان یەکێك لە منداڵیەوە شێت بوبێو بە شێتی بمرێ، سوننەت نیە (تلقین) بدرێ. ئینجا هەر چەند حەدیسەکەی (تلقین) بێهێزە، بەڵام لە چەند حەدیسێکی (صحیح)دا (شاهد)ی هەیە: وەك حەدیسەکەی (عثمان)ی ڕابردوو، جگە لەوەش حەدیسی بێهێز بۆ کردەوەی چاك ڕەفتاری پێدەکرێ، لە سەرچاوەکاندا ئەوها مەسەلەی (تلقین) ڕوون کراوەتەوەو لە (المجموع) و (مغني)دا فەرموویانە:

یەکێك لە لای سەری مردووەکە دادەنیشێ، واتە: ڕوو لە ڕووی مردووەکە دەکاو دەڵێ: (يَا عَبْدَالله ابْنَ أَمَةالله أُذْكُر الْعَهْدَ الَّذِى خَرَجْتَ عَلَيْه مِنَ الدُّنيا: شَهادَةَ أَنْ لآإلَهَ إلاَّاللهُ وَحْدَهُ لا شَرِيكَ لَهُ، وَأَنَّ مُحَمَّداً عَبْدُهُ وَرَسُولُهُ، وَأَنَّ الْجَنَّةَ حَقٌّ وَأَنَّ النَّارَ حَقٌّ وَأَنَّ الْبَعْثَ حَقٌّ وَأَنَّ السَّاعَةَ آتيَةٌ لاَرَيْبَ فِيها وَأَنَّ اللهَ يَبْعَثُ مَنْ فِي الْقُبُور، وَأَنَّكَ رَضِيتَ بِاللهِ رَبّاً وَبِالإسْلاَمِ دِيناً وَبِمُحَمَّدٍﷺ نَبِيّاً وَبِالْقُرْآنِ إمَاماً وَبِالْكَعْبَةِ قِبْلَةً وَبِالْمُؤْمِنِينَ إخْواناً، رَبِّيَ اللهُ لاَإلَهَ إلاَّ هُوَ عَلَيْهِ تَوَكَّلْتُ وَهُوَ رَبُّ الْعَرْشِ الْعَظِيمِ).

# [ باسی تازیەو گریان ]

١. (وَالتَّعْزِيَةُ سُنَّةٌ قَبْلَ دَفْنِهِ وَبَعْدَهُ ثَلاثَةَ أَيَّامٍ) تازیە، واتە: دڵدانەوەی خزمەکانی مردووەکە سوننەتەو خێرە

**[عَنْ عَبْدِاللهِ بن عَمْرورَضِي اللهُ عَنْهُما: أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ لِفَاطِمَةَ: مَا أَخْرَجَكِ يَا فَاطِمَةُ مِنْ بَيْتِكِ؟ قَالَتْ أَتَيْتُ أَهْلَ هَذَا الْمَيِّتِ فَتَرَحَّمْتُ إِلَيْهِمْ مَيِّتَهُمْ، أَوْ عَزَّيْتُهُمْ بِهِ]** حديث حسن رواه ابوداود ر٣١٢٥ والنسائي ر١٨٨٠، پێغەمبەرﷺ فەرموویە (فاطمة) ی کیژی خۆی: ئەوە لە بەرچی لە ماڵەوەت هاتویتە دەرەوە؟ (فاطمة) فەرمووی: هاتمە لای خزمەکانی ئەم مردووە، دوعام بۆ مردووەکەیان کردو دڵم دانەوە. ئینجا بزانە: سوننەتە: تازیە لە گشت خزمەکانی مردووەکە بکا: گەورەو بچوکو ئافرەتو پیاو. هەروەها لە دۆستو مێردو ژنو خەزورو خەسوشی، بەڵام نابێ ئافرەتی گەنج تازیە لە پیاوی بێگانە بکاو نابێ بێگانەش تازیە لە ئافرەتی گەنج بکا، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەکاندا فەرموویانە. هەروەها بزانە: تازیە تایبەت نیە تەنها بە مردن، بەڵکو هەر بەڵایەکی گیانی، یان ماڵی، تووشی موسوڵمان ببێ، سوننەتە: تازیەی لێ بکرێو دڵی بدرێتەوە، پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ: **[مَا مِنْ مُؤْمِنٍ يُعَزِّي أَخَاهُ بِمُصِيبَةٍ إِلاَّ كَسَاهُ اللهُ مِنْ حُلَلِ الْكَرَامَةِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ]** رواه إبن ماجه ر١٦٠١ والبيهقي ر٧٣٣٨ بإسناد حسن، هەر ئیمانداریك تازیە لە برای خۆی بکا بە هۆی بەڵایەك، خوای گەورە لە ڕۆژی قیامەتدا خشڵی ڕێزداری دەبەر دەکا.ئینجا کاتی تازیە لە مردنەوە دەست پێ دەکا پێش ناشتنی مردووەکە، چونکە لەو کاتەدا زۆرتر دڵتەنگن لە دوای ناشتنیش تازیەکە بەردەوام دەبێ سێ ڕۆژان، واتە: تازیەکردن لە دوای ئەوسێ ڕۆژانە ناپەسندە، مەگەر تازیەدارەکە لەو ماوەیەدا ئامادە نەبوبێ، یان تازیەکەرەکە هەواڵی مردنی نەزانیبێ، یان لە سەفەر بوبێ، لەو حاڵەتانەدا لە دوای

سێ ڕۆژەکان ناپەسند نیە، هەروەك لە سەرچاوەکاندا فەرموویانە.ئینجا بزانە: لە گشت سەرچاوەکاندا فەرموویانە: ناپەسندە خزمەکان لە شوێنێك دابنیشنو کۆ ببنەوە تاکو خەڵك تازیەیان لێبکا، بەڵکو دەبێ هەر کەسەیان بۆ کارو پێویستیەکانی خۆی بڕوا، جا هەر کەسێك بیانگاتێ، تازیەیان لێبکا، هەروەك لە (المجموع)و(تحفە) دا فەرموویانە.ئینجا لە تازیەکردندا فەرمان بە تازیەدارەکان دەکا: خۆڕاگر بن لە بەرامبەر ئەو بەڵایەو باسی پاداشتی قیامەتیان بۆ دەکا. کەواتە: ئەو حەدیسانەشیان بۆ دەخوێنێتەوە: کە باسی پاداشتی مردنی منداڵەکانو بەڵایەکانی تر دەکەن.هەروەها دوعا بۆ مردووە موسوڵمانەکەش دەکا.(رووناکی رب العالمین ڕوونکردنەوە منهاج الطالبین)ص١٤٧.

٢. (**وَيَجُوزُ الْبُكَاءُ عَلَيْهِ قَبْلَ الْمَوْتِ وَبَعْدَهُ**) گریان دروستە لە سەر مردووەکە پێش گیان دەرچوونی [**عَنْ أَنَسٍ**ﷺ: **أَخَذَ النَّبِيُّ**ﷺ **إِبْرَاهِيمَ فَقَبَّلَهُ وَشَمَّهُ–وَإِبْرَاهِيمُ يَجُودُ بِنَفْسِهِ– فَجَعَلَتْ عَيْنَا رَسُولِ اللهِ**ﷺ **تَذْرِفَانِ...**] الحدیث رواه البخاری ر١٣٠٣، پێغەمبەرﷺ (ابراهیم)ی کوڕی خۆی ماچ کردو بۆنی کرد لەو حاڵەتەدا (ابراهیم) گیانی دەردەچو- ئینجا چاوەکانی پێغەمبەرﷺ فرمێسکی لێدەرژا خوارەوە.هەروەها لە دوای مردنیش گریان دروستە [**عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ**ﷺ: **زَارَالنَّبِيُّ**ﷺ **قَبْرَ أُمِّهِ فَبَكَى وَأَبْكَى مَنْ حَوْلَهُ**]رواه مسلم ر٢٣٠٤، پێغەمبەرﷺ زیارەتی گۆڕی دایکی خۆی کرد، جا بەخۆی گریاو خەڵکی دەوروبەری خۆیشی گریاند.

٣. (**وَيَحْرُمُ النَّدْبُ بِتَعْدِيدِ شَمَائِلِهِ وَالنَّوْحُ وَالْجَزَعُ بِضَرْبِ صَدْرِهِ وَنَحْوِهِ**) حەرامە: سەردولکە پێداهەڵگوتنی مردووەکە وەك سیفەتی بەرزی باس بکاو مەدحی بکا حەرامە دەنگ هەڵێنان بە هاوارو ڕۆ ڕۆ، هەر چەند نەشگریێ حەرامە:دەربڕینی ناڕەزایی‌و بێزاری وەك مست لە سینەی خۆی بداو ئەو جۆرە شتانە:وەك ڕوو ڕنینو یەخەدادڕینو موو ڕاکێشانو قوڕو خۆڵ بە سەرداکردنو جل گۆڕینو دوعای خراپ، پێغەمبەرﷺدەفەرموێ: [**لَيْسَ مِنَّا مَنْ ضَرَبَ الْخُدُودَ وَشَقَّ الْجُيُوبَ وَدَعَا**

بِدَعْوَى الْجَاهِلِيَّةِ] رواه الشيخان البخاري ١٢٩٨ مسلم ر ٢٩٦، ئەو کەسە لە ئێمە نیە: کە چەپۆك لە ڕووی خۆی دەداو یەخەی دادەدڕێو بانگەوازی نەفامی پێش ئیسلامەتی دەکا. واتە: وەك کافرەکان گریەوزاری بۆ مردووەکەی دەکا.

# [ خواردەمەنی تازیە]

١.(وَلِجِيرَانَ أَهْلِه تَهْيِئَةُ طَعَامٍ يُشْبِعُهُمْ يَوْمَهُمْ وَلَيْلَتَهُمْ وَيُلَحُّ عَلَيْهِمْ فِي الأَكْلِ) بۆ دراوسێیەکانی کەسوکاری مردووەکەو هەم بۆ خزمە دوورەکانیشی سوننەتە خواردەمەنی دروست بکەن بۆ کەسوکاری مردووەکە، بەئەندازەیەکی وەها خواردنەکەلەڕۆژێكو شەوێکی ماتەمینی دا تێریان بکا، واتە: لە مردنیەوە ڕۆژو شەوەکە دەست پێدەکا. زۆر داوایان لێدەکرێ: تاکو خواردنەکە بخۆن، نەوەك شەرم بکەن [عَنْ عَبْدِاللهِ بن جَعْفَرَ رَضِى اللهُ عَنْهُما: لَمَّا جَاءَ نَعْيُ جَعْفَر قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: إِصْنَعُوا لآلِ جَعْفَرَ طَعَاماً فَإِنَّهُ قَدْ جَاءَهُمْ مَا يَشْغَلُهُمْ]رواه الترمذي ر٩٩٨ بسند صحيح، کە هەواڵی شەهیدبوونی (جعفر) گەیشتە (مدينە)، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: خواردەمەنیەك بۆ ماڵو منداڵەکانی (جعفر) دروست بکەن، چونکە ڕووداوێکی وەهایان تووش بووە: ماوەی دروستکردنی خواردنیان نیە. ئینجا بزانە: سوننەتە دەست بە سەری یەتیمەکاندا بێنێو ڕێزیان لێ بنێ، هەروەها لە دوای تەواوبوونی سێ ڕۆژەکەی تازیە، کوڵوخاوێنی بۆ تازیەدارەکان بکرێو سەری نێرینەکانیان بتاشرێ، بە بەڵگەی حەدیسەکەی منداڵەکانی (جعفر): (ڕووناکی رب العالمين ڕوونکردنەوە منهاج الطالبين)ص١٦٦.

٢. (وَيَحْرُمُ تَهْيِئَتُهُ لِلنَّائِحَاتِ وَاللهُ أَعْلَمُ) حەرامە: دروستکردنی خواردەمەنی بۆ ئەو ئافرەتانەی گریەو شین دەگێڕن، چونکە یارمەتیدانە لەسەر تاوانباری هەروەك لە

فەرمووده هاتووه عن أبي سعيد الخدري ﷺ: (عن النبي صلى الله عليه و سلم قال: لا تصحب إلا مؤمنا و لا يأكل طعامك إلا تقي) .المستدرك ر ٧١٦٩/شعب الايمان ر٩٣٨٣. واتە هاوڕێیەتی کەسێك مەکە ئەگەر ئیماندار نەبێت وە نابێ کەس خواردنت بخوا ئەگەر لە خوا ترس نەبێت. لە بەر ئەم فەرموودەیە نابێ بۆ ئەو ئافرەتانەی گریەو شین دەگێڕن خواردن ئامادە بکرێت جونکە نارەزای دەردەبڕن لە کاتی گریانیان وە خەلکیش فێردەکەن لە سەر ئەم کارە ناڕەوایە.

ئینجا بزانە: (بدعە)یەکی ناپەسندە: کەسوکاری مردووەکە خواردن دروست بکەن، تاکو خەڵکی کۆ بکەنەوە بۆ خواردنی، هەروەك لە سەرچاوەکاندا فەرموویانە، کەوابو: ئامادەبوونیش بۆ ئەو خواردنە هەر ناپەسندە، هەروەك لە (تحفە)دا فەرموویەتی [عَنْ جَرِير بن عَبْدالله ﷺ: كُنَّا نَعُدُّ الإجْتِمَاعَ إِلَى أَهْلِ الْمَيِّتِ وَصَنْعَهُمُ الطَّعَامَ مِنَ النِّيَاحَةِ]رواه ابن ماجه ر١٦١٢ واحمد باسناد صحيح، ئێمە کۆبوونەوەمان لە لای کەسوکاری مردووەکەو دروستکردنی خواردەمەنی ئەوانمان بە گریەوزاری دادەنا. واتە: لە سەردەمی پێغەمبەردا ﷺ. ئینجا بزانە: ئەو ناپەسندیە لە کاتێکدایە: کە خواردنەکە بە ماڵێکی وەها دروست نەکرابێ: کە بەشی شێتو یەتیمی تێدا بێ، ئەگینا: حەرامە، کەوابو: چارەی ئەو مەسەلەیە ئەمەیە: دراوسێو خزمە دوورەکانی مردووەکە خواردەمەنی دروست بکەنو بیبەخشنە ژنو منداڵو خزمە نزیکەکانی مردووەکە، جا ئەگەر ئەوان بیدەنە مێوانەکانی تازیە ناپەسند نیە، هەروەك لە (تحفە)دا فەرموویەتی. ئەوەش وا دەگەیەنێ: ئەگەر خەڵکی گەڕەکەکە، یان دێیەکە بە خۆشی خۆیان خواردن بدەنە مێوانەکانی تازیە، ئەویش ناپەسند نیە، چونکە دانیشتن بۆ تازیە-کە ناپەسندە- مەسەلەیەکە، نان دانیش مەسەلەیەکی ترە، وَاللهُ أَعْلَم. ئینجا بزانە: چلە، واتە: بیرەوەریو تازیە نوێکردنەوە لە دوای چل ڕۆژ، (بدعە)یەکی ناشیرنە، هەروەك لە (بجیرمی)دا فەرموویەتی.

# [تازیەکردن لە موسوڵمان و کافر چۆن دەکرێت]

١. (وَيُعَزَّى الْمُسْلِمُ بِالْمُسْلِمِ: أَعْظَمَ اللهُ أَجْرَكَ وَأَحْسَنَ عَزَائَكَ وَغَفَرَ لِمَيِّتِكَ) کە تازیە لە موسوڵمان دەکرێ بە هۆی مردووە موسوڵمانەکەی، سوننەتە پێ بڵێ: (أَعْظَمَ اللهُ أَجْرَكَ وَأَحْسَنَ عَزَائَكَ وَغَفَرَ لِمَيِّتِكَ) خوا پاداشت گەورەبکاو خوا سەبرو دڵدانەوەیەکی جوانت بداتیو خوا لە مردووەکەت خۆش ببێ.

٢.(وَبِالْكَافِرِ: أَعْظَمَ اللهُ أَجْرَكَ وَصَبَّرَكَ) هەورەها کە تازیە لە موسوڵمان دەکرێ بە هۆی مردووە کافرەکەی. تازیەکەرەکە بڵێ: (أَعْظَمَ اللهُ أَجْرَكَ وَصَبَّرَكَ) خوا پاداشتت گەورە بکاو سەبرت بداتێ.

٣ .(وَالْكَافِرُ بِالْمُسْلِمِ: غَفَرَاللهُ لِمَيِّتِكَ وَأَحْسَنَ عَزَائَكَ) کە تازیە لە کافر دەکرێ بە هۆی مردووە موسوڵمانەکەی، تازیەکەرەکە بڵێ: (غَفَرَاللهُ لِمَيِّتِكَ وَأَحْسَنَ عَزَائَكَ) خوا لە مردووەکەت خۆش ببێو سەبرو دڵدانەوەیەکی جوانت بداتێ.

# [ زیارەتی گۆڕستان ]

١. (وَزِيَارَةُ الْقُبُورِ لِلرِّجَالِ) سەردانی گۆڕەکان گۆڕستانی موسوڵمان سوننەتە: بۆ پیاوان، بە (إجماع)ی زانایانی ئیسلام، واتە: لە سەرەتای ئیسلامدا زیارەتی گۆڕەکان قەدەغە بوو. بەڵام (نسخ) کراوەو پێغەمبەرﷺ فەرمووی: [كُنْتُ نَهَيْتُكُمْ عَنْ زِيارَةِ الْقُبُورِ، فَزُورُوها فَإِنَّهَا تُذَكِّرُالآخِرَةَ]رواه مسلم ج ٢ ص ١٠٢٣ وأصحاب السنن، لەمەوپێش زیارەتی گۆڕەکان لە ئێوەم قەدەغە کردبو، بەڵام لە مەو دوا زیارەتی گۆڕەکان بکەن، چونکە قیامەتتان بە بیر دێنێتەوە.

٢. (وَتُكْرَهُ لِلنِّساءِ وَقِيلَ تَحْرُمُ وَقِيلَ تُبَاحُ) زیارەتی گۆڕ ناپەسندە بۆ ئافرەتان لە فەرموودەیەکی بێهێزدا: زیارەتی گۆڕ حەرامە: بۆ ئافرەتان، چونکە پێغەمبەرﷺ

دەفەرموێ: [لَعَنَ اللهُ زَائِرَاتِ الْقُبُورِ وَالْمُتَّخِذِينَ عَلَيْهَا الْمَساجِدَ والسُّرُجَ] رواه أصحاب السنن بسند صحيح، لەعنەتی خوا لەو ئافرەتانە بێ: کە زیارەتی گۆڕەکان دەکەن، لەعنەت لەو کەسانە بێ : کە مزگەوت لە سەر گۆڕ دروست دەکەنو چرا لە سەر گۆڕ دادەگیرسێنن. بەڵام فەرموودەی بەهێز وەڵامی داوەتەوە: ئەو لەعنەتە بۆ ئەو ئافرەتانەیە: کە لە سەر گۆڕ دەگریێنو ماتەمینی نوێ دەکەنەوە. هەروەك لە سەرچاوەکاندا فەرموویانە لە فەرموودەیەکی تری بێهێزدا: حەڵاڵە، واتە: ناپەسندیش نیە، بەو مەرجەی هیچ بێشەرعیەك ڕوونەدا.ئینجا بزانە: سەردانی گۆڕ لە گشت کاتێکدا سوننەتە، بە تایبەتیش لە عەسری پێنج شەممەوە تا ڕۆژی شەممە، هەروەهاش سەردانی گۆڕی دایکو باوکو خزمو دۆستەکانی زیاتر خێرترە، هەروەك لە حاشیەکانی (الشبراملسي)و(البجيرمي)و(الشرواني)دا ڕوون کراوەتەوە. (ڕووناکی رب العالمین ڕوونکردنەوە منهاج الطالبین)ص١٦٠.

٣. (وَيُسَلِّمُ الزَّائِرُ وَيَقْرَأُ وَيَدْعُو) سوننەتە: زیارەتکەرەکە یەکەمجار سەلام لە تێکڕای گۆڕستانەکە بکاو بڵێ: [اَلسَّلاَمُ عَلَيْكُمْ دَارَقَوْمٍ مُؤْمِنِينَ وإِنَّا إِنْ شَاءَاللهُ بِكُمْ لاَحِقُونَ] رواه احمد ر ٧٩٩٣ ومسلم ر ٦٠٨، وللترمذي ر ١٠٥٣: [يَغْفِرُاللهُ لَنَا وَلَكُمْ أَنْتُمْ سَلَفُنَا وَنَحْنُ بِالأَثَرِ].ئینجا پشت لە قیبلەو ڕوو لە مردووەکەی بکاو بە هەمان ووشەکانی ڕابردوو سەلامی لێبکا، پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ: [مَامِنْ عَبْدٍ يَمُرُّ بِقَبْرِ رَجُلٍ كَانَ يَعْرِفُهُ فِي الدُّنْيَا فَيُسَلِّمُ عَلَيْهِ إِلاَّ عَرَفَهُ وَرَدَّ عَلَيْهِ السَّلاَمَ]رواه ابن عبدالبر في التمهيد والاستذكار باسناد صحيح وجامع الاحاديث لجلال الدين السيوطي ر ٢٠٥٠٣، هەر کەسێك بە لای گۆڕی پیاوێکدا بڕوا کە لە دونیادا دەیناسی سەلامی لێ بکا، مردووەکە دەیناسێتەوەو وەڵامی سەلامەکەی دەداتەوە. ئینجا لەدوای سەلام، سوننەتە: زیارەتکەرەکە بە گوێرەی توانین هەندێك قورئان لە سەر گۆڕەکان بخوێنێ، ئینجا لە دوای قورئان خوێندن، ڕوو لە قیبلە دەکاو دوعا بۆ مردووەکەی دەکا، هەروەها بۆ مردووەکانی تریش دوعا بکا.ئینجا بزانە: دەست پێداهێنانی گۆڕو دیوارەکانیو

قەفەسەکەیو باوەش لێوەرهێنانیانو ماچ کردنیانو لە دەورە سوڕان، گشتی (بدعە) یەکی ناپەسندو ناشیرنن، هەروەك لە سەرچاوەکاندا فەرموویانە.

# [ خێرکردنی قورئان خوێندنودوعا بۆ مردوو ]

بەڵگەی یەکەم: قورئان خوای گەورە دەفورموێ:

{وَالَّذِينَ جَآءُو مِن بَعْدِهِمْ يَقُولُونَ رَبَّنَا اغْفِرْ لَنَا وَلإخْوَانِنَا الَّذِينَ سَبَقُونَا بِالإيمَانِ وَلا تَجْعَلْ فِي قُلُوبِنَا غِلاً لِّلَّذِينَ ءَامَنُوا } سورة الحشر/٩

واتە:ئەو کەسانەی کە لە دوایی کۆچکردوانی چینی یەکەم هاتن، ئەوانەش بەرستی موسڵمانن، موسڵمانیان لە خۆ خۆشتر دەوێ ولە خوا دەپاڕێنەوە دەڵێن ئەی پەروەردگاری ئێمە لێمان خۆش ببە لەو برایانەمانیش کە پێش ئێمە موسلمان بوین لەوانیش خۆش بە(واتە پێش ئێمە مردوون)، رق و کینەو غەرەز مەخە ناو دڵمان بەرامبەر ئەو کەسانەی کە باوڕیان هێناوە هەر تۆ خاوەن بەزیی و میهرەبانی. حشر ١٠ج٥ تەفسیری قورئانی پیرۆز.

بەڵگەی دووەم: فەرمودەی پێغەمبەرمانﷺ:

حَدَّثَنَا مُوسَى بْنُ مَرْوَانَ الرَّقِّيُّ حَدَّثَنَا شُعَيْبٌ – يَعْنِي ابْنَ إِسْحَاقَ – عَنِ الأَوْزَاعِيِّ عَنْ يَحْيَى بْنِ أَبِي كَثِيرٍ عَنْ أَبِي سَلَمَةَ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ صَلَّى رَسُولُ اللَّهِﷺ عَلَى جَنَازَةٍ فَقَالَ « اللَّهُمَّ اغْفِرْ لِحَيِّنَا وَمَيِّتِنَا وَصَغِيرِنَا وَكَبِيرِنَا وَذَكَرِنَا وَأُنْثَانَا وَشَاهِدِنَا وَغَائِبِنَا اللَّهُمَّ مَنْ أَحْيَيْتَهُ مِنَّا فَأَحْيِهِ عَلَى الإِيمَانِ وَمَنْ تَوَفَّيْتَهُ مِنَّا فَتَوَفَّهُ عَلَى الإِسْلاَمِ اللَّهُمَّ لاَ تَحْرِمْنَا أَجْرَهُ وَلاَ تُضِلَّنَا بَعْدَهُ ».. سنن ابی داود ج ٢ص ٣٢٠١

واتە : پێغەمبەرمان ﷺ دەفەرموێ (خوایە لە گوناهی زیندوەکان و مردوەکان و بچوك و گەورەمان ... خۆش بە). لەو فەرمودەدا ئەوەمان بۆ دەردەکەوێ کە پێغەمبەرمانﷺ دوعای بۆ مردووان کردووە.

عَنْ أَبِى هُرَيْرَةَ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ -صلى الله عليه وسلم- قَالَ « إِذَا مَاتَ الإِنْسَانُ انْقَطَعَ عَنْهُ عَمَلُهُ إِلاَّ مِنْ ثَلاَثَةٍ إِلاَّ مِنْ صَدَقَةٍ جَارِيَةٍ أَوْ عِلْمٍ يُنْتَفَعُ بِهِ أَوْ وَلَدٍ صَالِحٍ يَدْعُو لَهُ ».رواه مسلم ر ٤٣١٠.

واته: پێغەمبەرمان ﷺ دەفەرموێ (کاتی مرۆڤ دەمرێ کارو کردەوەی دەپچڕێت تەنها لە سێ شت نەبێ یەکەم خێرێکی بەردەوام دووەم زانستێکی سوود بەخش سێیەم نەوەیەکی صالح دوعای بو بکات).

وەهەروەها بە (اجماع)ی زانایانی ئیسلام خێرکردنو دوعاکردن بۆ مردووان سودی هەیەو دەیانگاتێ، جیاوازی نیە: خزم بۆیان بکا، یان بێگانە، [عَنْ عَائشةَرَضى اللهُ عَنْهَا: أَنَّ رَجُلاً أَتَى النَّبيَّﷺ فَقَالَ: يَارَسُول الله إِنَّ أُمِّي اُفْتُلتَتْ نَفْسُها وَلَمْ تُوصِ وَأَظُنُّهَا لَوْ تَكَلَّمَتْ تَصَدَّقَتْ، أَفَلَهَا أَجْرٌ إِنْ تَصَدَّقْتُ عَنْها؟ قَالَ: نَعَمْ] رواه الشيخان البخاری ١٣١٨ مسلم ر٢٣٧٣، پیاوێك بە پێغەمبەریﷺ گوت: دایکم کتوپڕ مردو وەسیەتیشی نەکردوە، وا تێدەگەم ئەگەر ماوەی قسەکردنی هەبوایە خێری دەکرد، ئایا خێری بۆ دەبێ ئەگەر من خێری بۆ بکەم؟ پێغەمبەرﷺ فەرمووی: بەڵێ. واتە خێرەکەی دەگاتێ. (رووناکی رب العالمين ڕوونکردنەوە منهاج الطالبين)ص١٦١.

دووەم: لە فەرموودەیەکی زانایانی مەزهەبی (شافعی)و لە هەرسێك مەزهەبەکەی تردا: خێری قورئان خوێندن دەگاتە مردوو

هەروەها ئیمام (أحمد بن حنبل) دەفەرموێ: هەر کاتێك چونە گۆڕستان، سووڕەتی (فاتیحە)و (قُلْ هُوَ اللهُ أَحَدٌ)و هەردوو (قُلْ أَعُوذُ)ەکان بخوێننو خێرەکەش بدەنە مردووەکان، چونکە خێرەکە دەیانگاتێ، هەروەك لە (تذكرة القرطبي)و (إرشاد العباد)و (هداية المرتاب)دا گێڕاویەتیانەوە.

کەواتە: بە خوێندنی ئەو چوار سوڕەتانە، یان تەنها یەکێکیان، سوننەتەکە بەجێ دێ، چونکە لە کاتی خوێندنی قورئاندا ڕەحمەتی خوا دێتە خوارەوە، هەروەك پێغەمبەرﷺ لە حەدیسەکەی سووڕەتی(الكهف)دا دەفەرموێ: [تِلْكَ السَّكِينَةُ تَنَزَّلَتْ بِالْقُرْآنِ]رواه

الشيخان البخاري ٥٠١١ مسلم ر ١٨٩٢، ئەوە ڕەحمەتی خوایە دڵفراوانی تێدایەو بەهۆی خوێندنی قورئان دێتە خوارەوە.

وەهەروەها [عَنْ ابْنِ عَبَّاسٍ قَالَ مَرَّ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بِقَبْرَيْنِ فَقَالَ إِنَّهُمَا لَيُعَذَّبَانِ وَمَا يُعَذَّبَانِ فِي كَبِيرٍ أَمَّا أَحَدُهُمَا فَكَانَ لَا يَسْتَتِرُ مِنْ الْبَوْلِ وَأَمَّا الْآخَرُ فَكَانَ يَمْشِي بِالنَّمِيمَةِ ثُمَّ أَخَذَ جَرِيدَةً رَطْبَةً فَشَقَّهَا نِصْفَيْنِ فَغَرَزَ فِي كُلِّ قَبْرٍ وَاحِدَةً قَالُوا يَا رَسُولَ اللَّهِ لِمَ فَعَلْتَ هَذَا قَالَ لَعَلَّهُ يُخَفِّفُ عَنْهُمَا مَا لَمْ يَيْبَسَا] البخاري ١٣٦١ سنن الكبير للبيهقي ر٤٣٠٩.

واتە: كوڕی عباس ووتی پێغەمبەرﷺ بە لای دوو گۆڕ تێپەڕی فەرمووی مردووی ناو ئەو دوو گۆڕە ئازار دەدرێن بەڵام لەسەر تاوانی گەورە ئازار نادرێن بەڵكو یەكەكیان خۆی پاك نە دەكردەوە پاش میز كردن ئەوەی تریان نەمیمی دەكرد لە دوادا دەستی دا شتڵێك كردیە دوو پارچە لە سەر هەردوو گۆڕەكەی دانا فەرمووی تكاوایە ئازاریان كەم بكاتەوە تاكو وشك نە بوونی.كەوا بوو دار چاندن خێر بە مردوو دەگات بە مەرجێك جێگا خەڵك تەنگ نەكات ئەگەر گۆڕستانەكە گشتی بوو . [وَعَنْ ابنِ عُمَرَ رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا: أَنَّهُ إِسْتَحَبَّ أَنْ يُقْرَأَ عَلَى الْقَبْرِ بَعْدَ الدَّفْنِ أَوَّلُ سُورَةِالْبَقَرَةِ وَخاتِمَتِهَا] رواه البيهقي ر ٧٣١٩بإسناد حسن. (ابن عمر) بە خێری دەزانی: سەرەتای سوورەتی (البقره)و كۆتاییەكەی لە دوای ناشتنی مردووەكە لە سەر گۆڕەكەی بخوێندرێ.

لە کۆتاییدا:

لە خوای باڵادەست داواکارم لێمان قبول بکا وە ئەگەر هەر هەڵێك هەبوو داوای لیبوردن دەکم جونکە جگە لەخوای گەوەرە کەس نیە هەڵە نەکا جا ئەگەر هەر هەلێك هەبوو دەتوانن لە ڕێگای ئەم ژمارە پیوەندیمان پیوە بکەن ٠٧٥٠٤٤٧٦٧٨٤ جێگای ڕێزو پێزانین دەبن خوای گەورە خێرو جاکەی هیچ کەسێك وون ناکات انشالله. وە نابێ چاکەی ئەو مامۆستایانم لە بیر بچێ کە لە خزمەتیان دەرسی شەرعیم خوێندیە جا لەخوای گەورە دەپارێمەوە بە ناوە پیرۆزەکانی کە لێیان رازی بێت وە بیانکاتە ڕەفیقی پێغەمبەر ﷺ لە رۆژی دوای وەهەروەها بۆ ئەوانەی کە بۆ جارێکیش دەرسم لایان خویندوە ئامین:

ناوەکان

١. باوکی بەڕێزم ملا اسماعیل: رحمەتی خوای لێ بێت مردووە.

٢. بەڕێز ملا کاك احمد ملا کاك أمین ملاشیخ وسانی: رحمەتی خوای لێ بێت مردووە.

٣. بەڕێز ملا محمد ملا اسماعیل ملا محمود ئێنەی.

٤. بەڕێز ملا سلیمان قیرژەی: پێش نوێژو ووتارخوێنی مزگەوتی شێخ موستەفا.

٥. بەڕێز ملا محمدی خوڕخوڕی: رحمەتی خوای لێ بێت مردووە.

٦. بەڕێز ملا شیخ ابراهیم: پێش نوێژو ووتارخوێنی مزگەوتی شێخ موستەفا .

٧. بەڕێز ملا علی بیرە عارەبان: رحمەتی خوای لێ بێت مردووە.

وەهەروەها خوا خێری ئەو برایانە بنووسێ کە یارمەتیان دام بۆ وێنەگرتنی چۆنیەتی شۆردن و کفن و لە گۆڕنان کە بە راست ماندووم کردن وە هەروەها خوا خێری مامۆستا ملاعبدالله هەرتەلی و مامۆستای خوشەویستم مامۆستا ملا علی خەتێ ومامۆستا ملا عبدالقادر بحرکەی بنوسێ کە بە پرسیار وەڵام

وەڵامیان دامەوە لە دەربارەی هەندێ لە مەسەلەکانی شەرعی وە کارئاسانیان بۆ کردم. وەهەروەها زۆر سوودم لە کتابی (ڕووناکی رب العالمین ڕوونکردنەوە منهاج الطالبین)کرد کە دەتوان بڵێم سەرچاوەیەکی سەرەکیم بوو لەم کتابە خوای گەورە پاداشتی مامۆستا مەلا عبدالله بداتەوە لە گەڵ برای بەڕێزم ماۆستا ملا نامیق کە پێداچونەوەی ئەم پەرتوەکەی بۆ کردم وەهەروەها ئەوەی یارمەتی دام جا ج بە نووسین یا بە ئامۆژکاری خوای گەورە لە هەموو لایەکمان رازی بێت بەدەستی پێغەمبەرەکەی ئاوی کەوسەر بەخۆێنەوە لە رۆژی دوای ئامین.

لە دوعاکانتان بێ بەشمان مەکەن

**وصلى الله على سيدنا محمدا وآله وأصحابه وأمته اجمعين**

# المصادر

١. القرآن الكريم.

٢. صحيح البخاري / محمد اسماعيل ابو عبدالله البخاري /دار طوق النجاة سنة ١٤٢٢ هجري.

٣. صحيح المسلم / ابو الحسن مسلم النيسابوري/ دار التراث العربي/ بيروت.

٤. سنن ابي داود / ابو داود سليمان بن الاشعث السجستاني/ دار الكتاب العربي / بيروت.

٥. سنن الترمذي / محمد بن عيسى الترمذي / دار احياء التراث العربي/ بيروت.

٦. سنن ابن الماجة / محمد بن يزيد أبو عبدالله القزويني/ دار الفكر العربي / بيروت.

٧. مسند احمد بن حنبل / أحمد بن حنبل أبو عبدالله الشيباني / دار مؤسسة الرسالة بيروت سنة ١٤٢٠هجري.

٨. سنن النسائي/أحمد بن شعيب أبو عبد الرحمن النسائي/ مكتب المطبوعات الإسلامية حلب سنة١٤٠٦هجري.

٩. المعجم الاوسطة / أبو القاسم سليمان بن أحمد الطبراني/ دار الحرمين القاهرة سنة١٤١٥هجري.

١٠. المعجم الكبير / سليمان بن أحمد بن أيوب أبو القاسم الطبراني/ مكتبة العلوم والحكم موصل سنة١٤٠٤هجري.

١١. سنن البيهقي الكبرى / أحمد بن الحسين بن علي بن موسى أبو بكر البيهقي/ مجلس دائرة المعارف النظامية الكائنة في الهند ببلدة حيدر آبادالطبعة الأولى. ١٣٤٤هجري

١٢. صحيح ابن حبان بتحقيق الارنؤوط / محمد بن حبان بن أحمد أبو حاتم التميمي البستي/مؤسسة الرسالة بيروت الطبعة الثانية ، ١٤١٤ .

١٣. المعجم الاوسط للطبري / أبو القاسم سليمان بن أحمد الطبراني/ دار الحرمين – القاهرة سنة ١٤١٥هجري.

١٤. جامع الأحاديث / جلال الدين السيوطي.
١٥. التذكرة في أحوال الموتى وأمور الأخرة / القرطبي/دار الفجر للتراث سنة ١٤٢١هجري.
١٦. تفسير الوسيط لسيد الطنطاوي / محمد سيد طنطاوي.
١٧. تفسير سراج المنير / محمد بن احمد الشربيني/ دار الكتب العلمية. بيروت.
١٨. صفوة التفاسير / محمد علي الصابوني.
١٩. تەفسیری قورئانی پیرۆز بەزوبانی کوردی / عبدالعزیز عەلائەدین موستەفا /ساڵی ٢٧٠٧کوردی.
٢٠. موطأ امام مالك / مالك بن أنس/مؤسسة زايد بن سلطان سنة ١٤٢٤ هجري.
٢١. (رووناكي رب العالمين رِوونكردنةوة منهاج الطالبين) ملا عبدالله ١٤٢٢ هةولێر.
٢٢. شرح الزركشي على مختصر الخرقي المذهب الحنبلي/شمس الدين أبي عبد الله الزركشي المصري الحنبلي/ دار الكتب العلمية بيروت سنة ١٤٢٣.
٢٣. تفسير الفخر الرازى /محمد بن عمر بن الحسين الرازي الشافعي المعروف بالفخر الرازي/دار إحياء التراث العربي
٢٤. المجموع: شرح المهذب / الإمام النواوي/ دار الفكر بيروت.
٢٥. تحفةالمحتاج: شرح المنهاج / الإمام إبن حجرالهيتمي.
٢٦. نهايةالمحتاج: شرح المنهاج / الإمام محمدالرملي.
٢٧. مغنى المحتاج : شرح المنهاج / الإمام محمد الخطيب الشربيني.
٢٨. اعانة الطالبين / للعلامة أبي بكر المشهور بالسيد البكري ابن السيد السيد محمد شطا الدمياطي.
٢٩. الشيرواني / عبد الحميد الشرواني.
٣٠. فقه العبادات / شافعي.
٣١. الحاوي الكبير الماوردى / العلامة أبو الحسن الماوردى/ دار الفكر بيروت.

٣٢. حاشية الجمل على المنهج لشيخ الإسلام زكريا الأنصاري / لعلامة الشيخ سليمان الجمل/دار الفكر بيروت.
٣٣. حاشية البجيرمي .
٣٤. اصول الفقه / عبدالكريم الزيدان/دار احسان سنة ١٤١٥هجري.
**٣٥. ڕێگای بەهەشت به هۆنراوەو پەخشان / مەلا عبدالكريم مدرس/چاپخانەی ئیرشاد بەغداد سالی ١٤٠٦هجری.**
**٣٦. بەرێكردنی مردوو بۆ جیهانی داهاتوو/ملا عمر سویری هەولیر ساڵ ١٤٣١كۆچی.**
٣٧. شعب الايمان / أبو بكر أحمد بن الحسين البيهقي/ دار الكتب العلمية سنة ١٤١٠هجري.
٣٨. تاريخ الدمشق / ابن عساكر/دار الفكر بيروت سنة ١٤١٩هجري.
٣٩. سير اعلام النبلاء / شمس الدين أبو عبد الله محمد بن أحمد الذَهَبي/ مؤسسة الرسالة.
٤٠. حلية الاولياء / أبو نعيم أحمد بن عبد الله الأصبهاني/ .
٤١. حاشيتا القليوبي وعميرة على كنز الراغبين شرح المنهاج /تحقيق عبدالحميد هنداوي/ مكتب العصرية بيروت سنة ١٤٢٨هجري
٤٢. مجمع الزوائد ومنبع الفوائد / للحافظ نور الدين علي بن أبي بكر الهيثمي/دار الفكر بيروت سنة ١٤١٢هجري.
٤٣. الكافي في فقة ابن الحنبل / الكافي في فقه الإمام المبجل أحمد بن حنبل عبد الله بن قدامة/مكتب الاسلامي بيروت .
٤٤. وصيايا العلماء عند الموت/ دار ابن كثير – بيروت الطبعة الأولى سنة ١٤٠٦هجري.
٤٥. الايضاح والتبين بمسألة التلقين / الامام أبي الخير محمد بن عبدالرحمان السخاوي / دار البشائر الاسلامية سنة ١٤٠٣هجري.
٤٦. سنن الدارمي / عبدالله بن عبدالرحمن أبو محمد الدارمي دار الكتاب العربي –

بيروت سنة ١٤٠٧هجري.

٤٧. المستدرك / محمد بن عبدالله أبو عبدالله الحاكم النيسابوري /دار الكتب العلمية بيروت سنة ١٤١١هجري

٤٨. المصنف في الأحاديث والآثار/ أبو بكر عبد الله بن محمد بن أبي شيبة الكوفي/ مكتبة الرشد – الرياض سنة ١٤٠٩ هجري.

**تێبینی:چەند زانیاریەك دەربارەی هەندێك لە زاراوەکان**

١. ج .واتە (جزء) بەش :ص. واتە (صفحە) لاپەر : ر .(رقم) ژمارە.

٢. هەروەك لە سەرچاوەکاندا فەرموویانە، یان ڕوون کراوەتەوە، مەبەستی ئەم چوار کتێبەیە: (المجموع )-(تحفة المحتاج)- (نهاية المحتاج ) -(مغنى المحتاج).

٣. رواه الشيخان، مەبەستی ئیمامی (البخاری و مسلم).

٤. رواه اصحاب السنن، مەبەستی ئیمامی (أبوداود والنسائی والترمذی).

# ناوەرۆک